
چیرۆک
خاڵ عەباس
نووسەر: خوسرەو شایانفەر
نەشری ژیر
خاڵ عەباس
خوسرەو شایانفەر
لەگەرمەی سڵاو و چاکوخۆشی و سەرسوڕماندا، بەپەلە و
لەڕووی ناعیلاجی، سۆبەی نەوتی لە باوەش گرت. لاڕوومەتی
ڕۆچووی هەزارگنجی بردە پێش و لە مەودای دوو بۆ سێ
میلیمتیری سۆبەکە، ڕایگرت. سۆبەی بەستەزمان ئەو ئێوارەیە
هێندەی درابۆیە کە لە ئاکامدا بەو قەناعەتە گەیبوو ...
نەشری ژیر

# خاڵ عەباس

سرشناسه : شایان‌فر، خسرو، ۱۳۶۲-
عنوان و نام پدیدآور : خاڵعه‌باس/خسرو شایان‌فر.
مشخصات نشر : مهاباد: نشر ژیر، ۱۳۹۹.
مشخصات ظاهری : ۱۴۵ ص.
شابک : ۹۷۸۶۲۲۹۹۰۶۰۷۱
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
موضوع : داستان‌های کردی -- قرن ۱۴
موضوع : Kurdish fiction -- 20th century
رده بندی کنگره : PIR۳۲۵۶
رده بندی دیویی : ۸فا۹/۲۳
شماره کتابشناسی ملی : ۷۲۷۲۳۹۷

خاڵعه‌باس(چیرۆک)
نووسه‌ر: خوسره‌و شایان‌فه‌ر
ناوه‌ندی بڵاوکردنه‌وه: نه‌شری ژیر – مه‌هاباد
شابک: ۹۷۸۶۲۲۹۹۰۶۰۷۱
پیت‌چن: حه‌میده قادرزاده
ڕووبه‌رگ: خوسره‌و شایان‌فه‌ر
چاپ: یه‌که‌م ۱۳۹۹
به‌رگه‌ژمێر: ۱۰۰۰
ناونیشان: مه‌هاباد، شه‌قامی مزگه‌وتی جامیع، پاساژی میدیا، نهۆمی یه‌که‌م
ئیمه‌یلی نووسه‌ر: xusrewshayan@gmail.com

نرخ: ۳۰۰۰۰ تمه‌ن

زمانە شڕەکەی، تف پڕژاندنی، قسەکردنی تاوتاوی گەڵ خۆی یا مەنتقە تایبەتەکەی، هەموویان بۆ نێودێرکردن وەک تایبەتمەندی هەرەگرینگی دەبوون. بەڵام ئەو تایبەتمەندییانە لەو کات و شوێنەدا نەک جیاواز، بگرە زۆریش ئاسایی بوون و نەدبوونە جێی سرنجی من یا هاوتەمەنانم. بۆ من وەک منداڵێک، ئەو هەر لە سەرەتاوە خۆی بە باڵتۆ تایبەتەکەی لە مێشکمدا پێناسە کردبوو. ئەو باڵتۆ تایبەتەی ئێستا دەچێتە چوارچێوەی نۆستالۆژی هاوتەمەنانی من.

باڵتۆیەکی درێژ کە ئێستاش بۆم دەرنەکەوت ڕەنگی چییە. کە دەمکوت خاکییە، کاکم دەیکوت: کوێری! نازانی بۆرە. دایکم دەیکوت: ملتان شکێ! ئەدی لەو مەدرەسەی چتان فێردەکەن؟ ئەوە شینکییە. خوشکم دەیکوت: خانمەکەمان بەوەی دەڵێ سەبزئابی. بەڵام بابم هەر دەیکوت باڵتۆیە.

ئـــاوابوو کە کـــۆلکەزێڕینەیەک بە مەزەنـــدەی دەورووبەریەکـــان و بەهـــۆی کـــۆن بـــوون و کـــاڵ بـــوونەوەی، لەبـــارەی ئەو بـــاڵتۆ تـــایبەتە پەیـــدا بـــوو و بـــوو بە هـــۆی ئەوەیـــکە ڕەنـــگەکەی، وەک سورێک بمێنێتەوە.

ئەمـن دواتـر لە شتێک سەداسەد دڵنیا بووم، ئەویش ئەوە بوو کە بـــاڵتۆکە ئاڵمـــانییە. پشـــتیوانی ســـەرەکی ئەو دڵنیـــا بـــوونەم، ئـــاڵایەکی ئاڵمـــان بـــوو کە بە قـــۆڵی، لە نزیـــک شـــانی وەبـــوو. هەڵـــبەت ئەوکـــات بە خـــاترجەمی دوو ئاڵمـــان هەبـــوو، بەڵام بـــۆ مـــن زانســـتەکەم ئەوەنـــدەی برنەدەکـــرد ســـەر لە بلـــۆکی ڕۆژهەلات و ڕۆژئـــاوا دەرکەم و بـــزانم کـــامە ئاڵمـــانە. بـــۆ مـــن وەک منـــداڵێکی لادێیـــی، دنیـــا چـــوارپێنج وڵات زیـــاتر نەبـــوو. عێـــراق بـــوو، ئەوە شـــەڕمان دەگەڵ دەکـــرد. ڕۆژێکـــی گەرمـــی هـــاوین، قرچەقرچـــی گەرمـــای نیـــوەڕۆیە، عەجەم پێوەربـــوون، کـــامیلی کـــوڕی وەســـتا برایمیـــان دە ژووریـــدا گـــرت، دەپشـــتی تۆیۆتایـــان هاویشـــت، بردیـــان. دواتـــر ژنەگەلـــی کـــۆڵان دەیـــانکوت ئەوە ســـەرباز فینـــاری بـــووە یەکســـەر بردوویـــانە بـــۆ شـــەڕی عێراقێ. ئەودەمی بوو کە عێراقم ناسی.

ئامریکـــام لە قوتابخـــانە ناســـی. لە گۆشـــەی حەوشـــەی قوتابخـــانە لە دوو لای دیـــــواری ئاودەســـــتەکان بە گەورەیـــــی نوســـــرابوو (مـرگ بـر آمریکـا). وشـەی (مـرگ) لە لایەک بە فراوانـی پەلـی ڕاکێشـــابوو بەڵام (بـــر) و (آمریکـــا)یەکە کەوتبـــوونە ســـووچی

دیــوارەکە و لەبەر بێجێگــایی، تەواو یەکتریــان لە ئــامێز گرتبــوو. قوتابیــانی پــۆلی چــوار و پێــنج دەیــانکوت ئەوە نێــوی وڵاتــێکە زۆر گەورەیە لەســەر نەخشــە دیتوومــانە. ســەعوودیش هەبــوو. بــاپیرم دەیکــوت حەج لەوێــیە. ئەوکــات پێموابــوو حەج شــارە. هەڵــبەت وڵاتــــی نامۆشــــم بیســــتبوو، وەک عــــرووس، بــــابم دەیکــــوت لە ئەمیــرکەش گەورەتــرە بەڵام چەنــد ســاڵی پێچــوو تــا لە ســەر نەخشــە دیــتمەوە. بە قەولــی دایکــم دەیکــوت، خوێنــدن هەر بــۆ ئەو شتانە باشە.

بــاڵتۆکە درێــژ بــوو هەتــا ناوەڕاســتی گیرفــانی پــاتۆڵەکەی دەهــات، بــــۆیە قەت دەســــتی دەگیرفــــانی پــــانتۆڵەکەی نەدەنــــا. هەردوو دەســــتی وەک ئەوەی کەلەمــــچە کرابــــێ، دەنێــــو گیرفانەکــــانی پێشــێی دەنــا هەربــۆیە شــانی خڕدەکــردەوە. ئەو شــانخڕکردنەوە، بــۆی ببــوو بە عــادەت. باڵتۆشــی دەبەردا نەبــا دەســتی هەر لە پــــێش خــــۆی دەڕۆیشــــتن، وەک ئەوەی بەرگــــری لە شــــوێنە هەستیارەکانی بکا.

دیــوی ژووری بــاڵتۆکەی، خەزێکــی ســپی، کــوڵکن بــوو کە شــێوەی لە مــــووی بــــزنە مەرەز دەچــــوو. بۆخــــۆی دەیکــــوت زۆر گەرمە، دەڵێــــی کورســــیت داخســــتووە. چ ئەوکــــات چ ئێســــتاش نــــاتوانم ڕادەی گەرمــــای بــــاڵتۆکەی مەزەنــــدە بــــکەم، چــــونکە قەتــــم تەجــــروبەی کورســــی نەبــــووە. بەڵام پێمــــوانەبێ زۆر گەرم بــــووبێ، چــــونکە لە دەر و ژوور هەر دەبەری دابــــوو . تەنیــــا جیــــاوازی،

دوو دوگمەی سەرێی بوو کە لە ژوورێ دەکراوە لە دەرێ دادەخرا. کڵاوێکی زەلامی پێوەنووساویشی هەبوو کە تەنیا کەڵکی، ڕۆژی بارانی بوو، بۆ ئەوەی پێچ و کڵاوەکەی تەڕ نەبێ لە سەری دەنا. بەو سەروسیمایە لە پشتەوەڕا وەک ئەوەی دەچوو، ڕکەکەوت بۆ ڕاو، لەسەر تاشە بەردێک دانابێ.

ئەو باڵتۆ تایبەتە، یەکێک لە شتە زۆر خۆشەویستەکانی خاڵ عەباس بوو. ڕادەی خۆشەویستییەکەی گەیبووە ئاستی شانازی. ئەو شانازییە لە درێژخایەن، کاری کردبوو سەر هەموو ئەو کەسانەی شانازی ناسینی خاڵعەباسیان بە نەسیب ببوو، بەجۆرێک، باڵتۆی ئاڵمانی بێ خاڵعەباس و خاڵ عەباس بێ باڵتۆی ئاڵمانی، لە گەڕەکی ئێمە شتێکی نامۆ بوو.

شانازیکردنەکەی بە ڕادەیەک بوو کە بە هەموو تاقەتەوە، هەوڵی بە خۆماڵی کردنی ئەو بەرهەمە بێگانەیەی دەدا بە جۆرێک سەرتۆپی قسەی ئەوە بوو کە دەیکوت:

- ئەو وڵاتەی ئێمەش ئەوەندە باڵتۆیەی بەکەلک دێ، دەنا ئەوی دیکەی هیچی بە زیاد نەبێ.

ئەو هەستە تایبەتەی خاڵعەباس بۆ باڵتۆی ئاڵمانی، ساڵانێکی زۆر بوو هەبوو . کەس بڕوای نەدەکرد جرج بکەوێتە ئەو پێوەندییە بەسۆزە و خاڵعەباس بۆ تەماحی ماڵی دنیایە،

چاوپۆشی لە ستاندارەکانی بکا. بەڵام ئەو ئێوارەیەی بەندی سەرماوەز کە وەک جاری جاران، بەبێ لەدەرکەدان لێمان وەژوور کەوت، سەرەتایەک بوو بۆ دابەزینی ئاستی شکۆی ئەو بەرهەمە ئێستا خۆماڵیکراوە لە مێشکی خاڵعەباسدا.

ئەو ئێوارەیە هەرکە لێویکی بەبزەمان لە سەرووی دیمەنێکی تەواو کەسک هاتە بەرچاو تێکرا بستێک زارمان داپچڕی. ئاخۆ چ قەوماوە؟ لێی دزراوە؟ نا داخوا پیس بووە، شووردوویەتی. بەڵام ناکرێ، چۆن دەبێ، خۆ هەتا ویشک نەبێتەوە بە دڵنیاییەوە لە ماڵ نایەتە دەر. هەر ئەوەی کە بەبێ باڵتۆی ئاڵمانی، بەو ویشکە سەرمایە خۆی گەیاندۆتە ئێرە، دیارە پرسەکە زۆر گرینگە. لە نەمانی باڵتۆی ئاڵمانی گرینگتر، بوونی کۆتی ئامریکایی بوو ئەویش لەبەر خاڵعەباسیدا. خاڵ عەباسێک کە بێزی لێیدەبۆوە و نێوی نابوو کۆتی چەرچییان. بەڵام هۆی ئەوەی کە شانازیکەر و داکۆکیکەری بەتینی باڵتۆی ئاڵمانی، وا کوتوپڕ، خزیوەتە زۆنی سەوزەوە، دەبێ چی بێ؟

لەگەرمەی سڵاو و چاکوخۆشی و سەرسوڕماندا، بەپەلە و لەڕووی ناعیلاجی، سۆبەی نەوتی لە باوەش گرت. لاڕوومەتی ڕۆچووی هەزارگنجی بردە پێش و لە مەودای دوو بۆ سێ میلیمتری سۆبەکە ڕایگرت. سۆبەی بەستەزمان ئەو ئێوارەیە هێندەی درابۆیە کە لە ئاکامدا بەو قەناعەتە گەیبوو کە

هەوای زۆر ساردە، هەربۆیە بەوپەڕی توانای خۆی داییسا و هەردووک لاگوویی، لەسەری لووتی خاڵ عەباس کە بە سەرما سوور ببۆوە چاکتر سوور ببوونەوە. پێموایە لەتاو سەری لووتی، سووری لاگوویی سۆبەی نەدیت، بۆیە بەوجۆرە، خۆی ئامبازی سۆبەکە کرد. ئەو بەیەکگەیشتنە لە ئاکامدا سێ لەسەر چواری لاسمێڵێکی هەڵپرووزاند. سەرەڕای ئەو خەسارە گەورەیە، ئەوە هاواری بینەران بوو کە ئاگاداری کردەوە. ئەویش بە ڕستەیەکی تایبەت کاردانەوەی خۆی پێشاندا:

- گۆڕی بابی خێوی ... ئەوە بۆ وا سوور بۆتەوە.

لەدرێژەدا هەروا کە خاڵعەباس خەریک بوو خاو دەبۆوە و بۆ دواندن دەبوو، دایکم بە گوڕوتینێکەوە کوتی: حەک ڕەبی موبارەک بێ! کاکە ئەو کۆتە جوانەت کەنگێ کڕیوە؟

بۆ کاردانەوە بەو تاریفە، خاڵعەباس زەردەخەنەیەکی هاتێ و سمێڵە ئێستا لاسەنگەکانی، سەروخوارێکیان کرد بەڵام وەک ئەوەی لاسایی ئەکتەرە کلاسیکەکان بکاتەوە، بە بێدەنگێکی ماوەکورت، هەستی پرسیارکەرانەی بینەرانی بەهێزتر کرد. لەپێشدا بە گۆشەی پشتێنەکەی، کاریگەری سەرمای ئەو ئێوارەیەی لە بەر کەپۆی سڕی. دەستێکی بۆ گیرفانی پانتۆڵەکەی برد و قووتووی توتنوپەڕەکەی هێنادەرێ. هاوکات کە خەریک بوو جغارەیەکی بە قەد قامکی شادەی

ئەستوور هەڵدەبەست، بێدەنگی شکاند و باسێکی تێروتەسەلی لەسەر شێوازی کڕینی ئەو قاوغە نوێیە بۆ کردین. گۆیا ساعەتێک لەمەوبەر لە بازاڕی دەسفرۆشان، نیوە قیمەت، لە بە وتەی خۆی، هەتیوێکی بەڕەڵلای کڕیوە. هەڵبەت هیچ ئەو باسەی نەورووژاند کە هۆی ئەو سەنگەر گوێزتنەوەی چ بووە. بۆ کەسێک خاڵعەباسی ناسیبا، زوو تێدەگەیشت کە هەستی خاڵعەباس بۆ ئەوەی وەک سەوداکەرێکی چاک بناسرێ، زاڵە بە سەر هەموو شتێکی تر. هەرزانی کۆتەکە ئەگەرچی ئەفسانەیەکی تەمەنکورت بوو، ببوو بە هۆی وروژاندنی ئەو هەستەی خاڵ عەباس و پشتکردن لە شانازییەکی لەمێژینە.

بابم کە تا ئەوکاتە، کەشی شەڕی دووهەمی جیهانی بەسەریدا زاڵ بوو و لە بەرەی هاوپەیمانانەوە، بەردەوام خەریک بوو تەنیا سەمبۆلی لەبەردەستی ئاڵمانی دەکوتا، وەک کاردانەوەیەک بەو ڕووداوە ئەویش سەنگەری گوێزتەوە و وەک دژایەتییەک کەوتە لۆمەی ئەو خیانەتەی خاڵعەباس. هەربۆیە لە دەربڕینێکی لە ناکاو کوتی:

- وەڵلا کۆتی ئامریکایی هەر نموودی هەیە، دەنا ترێ سەش ناگێڕێتەوە.

ئەو دەربڕینە ناجوامێریانەی بابم، ئەگەرچی لە پێوەندی ڕۆژانەی دەگەڵ خاڵم، شتێکی ئاسایی بوو، بەڵام خاڵ عەباسی

کـافر کـرد بە جۆرێـک وەک تایبەتمەنـدی ناسـراوی خـۆی کە لە کـاتی قەڵسـی لەڕادەبەدەری نـوتقی دەبەسـرا و کـونی جنێـوی دەبـۆوە، هیچـی بـۆ نەکـوترا و بە هێنـدێک مـایەوە، لەجیـاتی جنێـو بە دەنگێکی گاڵتەئامێز کوتی:

- بەڵێ فەرمایشتە!!!

ئێسـتا کە بیـری لێـدەکەمەوە، پێمـوایە ئەوکـاتە حەسـوودی بە خـاڵم دەکـرد، چـونکە تـاریفی کـۆتی ئامریکـاییم زۆرجـار لە زمـانی خـۆی بیسـتبوو، بەڵام بە هـۆی ئەوەیـکە زۆر گـران بـوو بـۆی نەدەکـرِدرا. جارێـک کە مـامم یەکـدانەی کـۆنی کـاڵبووەی لە حەوتە بـازاڕی کڕیبـوو، ئەویـش چـوو یەکـدانەی بەدەڵـی کڕیبـوو، بەڵام هەرکە چـاوی بە جلکشـۆر کەوتبـوو، ڕەنگـی بە بەرێـوە نەمـابوو. پـاش ئەوە ئیـدی وازی لەکـۆتی ئامریکـایی هێنـا و چیرۆکی خۆشەویستیان چووە باوەشی مێژوو.

هەڵـبەت بـابم هەر بەوەنـدە نەوەسـتا و لە دژە کـاردانەوەیەک، گـورزی ئـاخری خـۆی بە هەمـوو هێـزەوە وەشـاند و سـووکترین ڕستەی خۆی، ئانگژای کۆتەکەی خاڵ عەباس کرد:

- ئەوە حەسڵ نییە.

ئەو وشـەیە چ ئێسـتا و چ ئەوکـات، یەکێـک لە گرینگتـرین وشـەکانی نێـو هەنبـانەی وشـەگەلی ئێمەمانـان بـووە، ئەگەرچـی سـەرچاوەی پەیـدابوونی نـاڕوونە. بە پـێچەوانەی ئەو بـاوەڕەی

ئێستا هەیە کە لەو جۆرە کاتانەدا پەنجەی تۆمەت بۆ وڵاتی چین ڕادەدێرن، ئەوکات وڵاتی چین هێشتا بۆ ئەو باسە نێوبانگی دەرنەکردبوو و بەتوندی سەرقاڵی شەڕی دەستەویەخە دەگەڵ هەژاری بوو. ئەوکات پێوانەی نرخاندنی هەموو شتێک، ژاپۆن بوو. ئەگەر ژاپۆن با ئەوە باش بوو، بەڵام ئەگەر ژاپۆن نەبا، ئەوە گومانی تێدابوو و کەس بۆی گرینگ نەبوو ئەریّ لە کوێڕا هاتووە. هەروا بە ئاسانی!!! هەرچەند هێندێک ئامراز و کەرەسە هەبوون کە وەک قیلی کەوای سپی وابوون و خۆیان بە نێوی وڵاتێکەوە بەستبوو. کەس بیری لەوە نەدەکردەوە، بکریّ ئەو شتانە بە نێوی وڵاتێکی دیکە وەنووسێن. تراکتۆری ڕۆمانی، گازی ڕووسی، سێوی لوبنان، و لە هەموان گرینگتر کۆتی ئامریکایی.

لەڕاستێدا بۆ بابم حەسڵ بوون یا نەبوونی ئەو کۆتە گرینگ نەبوو، هەرئەوەی کە لاتاوێک بە خاڵعەباس دادا یا وە قیرەی خا مەبەستی خۆی پێکاوە. هەمیشە ڕەوتی ڕووداوەکان ئاوابوون و هیچ کامیان قەبووڵیان نەدەکرد پێگەی ئەویتریان بەهێزتر بیّ.

ئەورۆژە بابم مەبەستی خۆی زۆر بە باشی پێکا، چونکە تەواوی ئاماژەکانی قەڵسی تایبەتی خاڵعەباس، لە سەر دەموچاوی جێگیر بوون. لێوی خوارێی لەسەر چەنەی ڕمبازێنی دەکرد و هاوکات قامکی بە جغارەوە، لەبەری

دەگێـــــڕاوە. زاری دەگەڵ هەر وشـــــەیەک کە دەهـــــاتە دەر، ئاوپڕژێنی چواردەوری دەکرد.

- قســەی قــۆڕ. بە زەمــانەتم کڕیــوە، هەتیــو کــوتی بــڕۆ بیشــۆ، بێمنەت، کاڵ بۆوە ماڵی خۆم.

- ئەوە کــاڵ بۆوە،کــوا هەتیــو؟ قەتــت دیتــووە؟ دەیناســی؟ دەبــڕۆ بیبینەوە.

- کــوڕە ئەوە دەڵێــی چــی؟ وەڵــڵا بــزانە چــۆنی دەبیــنمەوە! عەباســی مرۆتـــێ نەبـــم، ئەگەر لەژووریـــی نەهێـــنمە دەرێ. بەبـــووکی دەبەم... .

هێشــتا حەســڵ بــوون یــا نەبــوونی ئەو کــۆتە دیــار نەبــوو کەچــی خاڵعەباس لە ڕقی بابم پیلانی کوشتنی کابراشی داڕشتبوو.

لەو کـــاتەدا دایکـــم کە دیتـــی زۆر گەرم داهـــاتووە لەولاشـــەوە خەریــکە لە ئاســت بــابم زۆر کەســاد دەبــێ، لغــاوی باســەکەی گرتەدەست.

-کوڕەکــاکە ڕەبــی موبــارەک بــێ! وەڵڵاهــی زۆر جــوانە. ئەو ســپیاڵە چ بــوو دەبەرت دەکــرد؟! مــاڵتە خــۆ کــڕووی دێــی هەر پێوەبــوو. ڕەنگـــی بە بەرەوە نەمـــابوو. دەتکـــوت یەخســـیری مەکـــکە و مەدیــنەی. ئەوە جــوان و لەبــار و ســووک. قیــت و قــۆز بۆخــۆت

دەبەری دەکەی. بەخـــودای چڵکهەڵگریشــــە، بیـــدە بە بـــراژنم ئەوشۆ بۆت بشوا، بەخودای ئەوەندە جوان دەبێ.

دایکـم بـۆ مـاوەیەک وای لغـاوی باسـەکە گـرتە دەسـت کە نەک هەر کـاکی لە دەسـت ئەو زاڵـمە ڕزگـار کـرد، بەڵکـوو ئەجێنـدای کۆبوونەوەکەشی لە بیر جەماوەر بردەوە.

خاڵعەبـاس کە لەژێــر هێرشــی دڕنــدانەی زاواکەی، پشــوویەکی هــاتەوە بەرێ، دیــار بــوو لە هەســتی ڕاســتەقینەی خــۆی دڵنیــا نەبــوو. نەیــدەزانی بەو وتــانەی خوشــکی خۆشــحاڵ بــێ یــا نــاڕاحەت. لە ئاکامــدا پــاش تاوێــک، لە نێــو ئــاپۆڕەی مەچــۆوە شــامێ لێــرە بــکە، بە شــێوەیەکی تەواو دڕدۆنــگ، مــاڵی ئــێمەی جێهێشت.

لــووتکەی چیــرۆکەکە ڕۆژی دواتــر بــوو، کاتێــک دەگەڵ دایکــم لەبەر دەرگــا ڕاوەســتابووین. خــاڵ عەبــاس بە ســیمای ئاشــنای چەنـــدین ســـاڵەوە خەریـــک بـــوو خـــۆی لەبەر نیگـــای پرســیارکەرانەی ئــێمە دەدزێــوە. وەک ئەوەی ئــێمەی نەدیتبــێ، خەریــک بــوو دەچــووە ژووری. دایکــم بەبــێ بەفیرۆدانــی کــات، ئەگەرچــی مەودامــان لە پەنجــا میتــر زیــاتر بــوو، بەدەنگێکــی بەرز هاواری کرد: کاکە بەخێرێیەوە!!

خاڵعەبـاس کە دڵنیـابوو پێوەبـووە و لەو دڵنیـاتر ئەوەیـکە دایکـم لەو مەودایەڕا هەواڵـــی کـــۆتی ئامریکـــایی لێدەپرســـێ، هەر

بەغارێـک ڕوویکـردە دەرکـی ئـێمە و لە بـن گـوێی دایکـم جـوابی بەخێرهاتنەکەی دایەوە.

-سەلامەت بی خوشکێ. بەو سەرمایەی بۆ لەدەرێن؟

دایکـــم وەک ئەوەی پرســـیاری خـــاڵ عەباســـی هەر نەبیســـتبێ، خێرا پرسیارێکی دەپاڵ کردەوە.

-ئێی!!!! ئەدی کاکە ئەوە کوا کۆتە تازەکەت؟

خـــاڵ عەبـــاس وەک ئەوەی ســـوڕێکی گرینـــگ بـــدرکێنێ، خێـــرا ســـەرێکی بە حەوشـــەی ئـــێمە داگـــرت، نەوەک کەســـی لێبـــێ، بەتایبەت بابم، ئەوجار لووتی داژەنی و فەرمووی:

- وەڵـــڵا، ئەوە لە مـــاڵێ فڕێمـــداوە. ئەو ژنە شـــەوێ دە ئـــاوێی هاویشت، ئەوی ڕەنگ بوو پێیەوە نەما.

- ئەیارۆ بۆ؟

- کچێ ئەو سەگبابە درۆی دەکرد خۆ حەسڵ نەبوو.

- ئەدی وەدووی نەکەوتی؟

- وەدووی چـــی کەوم. کوتیـــان موعتـــادە. ئەوە گرتباشـــم چـــم لێکردبا؟

- کـــوڕە چاکـــت کـــرد، تـــازە لێـــیگەڕێ لەو ســـەگبابەی، نەچـــی وەدووی کەوی بەخـــودای کوڕەکانیشـــت لـــێ موعتـــاد دەکـــا.

وەبــزانە ســەگ خــواردی. بــاڵتۆی خــۆت جــوان و لەبــار چییەتــی؟ گەرم و خۆشــە. دەبەریــکە دەنگــێش مەکە. خــۆ مــاڵتە دوێنــێ هەر وەختبوو سەرماش بتبا. جا چانێ ئەوە تینێکی هەیە.

دایکــم بە دەرکردنــی بەرگــی دووهەمــی بیرۆکەکــانی خــۆی، دژ بە بەرگــی یەکەمــی کە دوێنــێ دەریکردبــوو، دەســتیکرد بە دڵخۆشــیدانەوەی خــاڵ عەباســی، بەبــێ ڕەچــاوکردنی ئەو ڕاســتییە کە نرخــی کــۆتێکی ئامریکــایی بەقەد داهــاتی مــانگێکی کــاری خاڵ عەباس بوو. کارێک کە دە ساڵدا چوارمانگی نەدەکرد.

خاڵعەبـــاس وەک ئەوەی بـــیهەوێ زوو کۆتـــایی بە باســـەکە بێنــێ، هــیچ بەشــداری وتــووێژە ســەپێندراوەکەی دایکــم نەبــوو. تەنیــا گــوێی ڕاگرتبــوو و چــاوی بڕیبــوو پەڵەبەفرێکــی قــوڕاوی کە لە ســەر ئەرز بە یــارمەتی ســەرمای ســەرماوەز، بەربەرەکــانی خــۆری بێتــاقەتی دەکــرد. لە ئاکامــدا بــۆ خــۆ دزینەوەیەکــی خێراتر ئاوا کۆتایی بە وتووێژەکە هێنا:

- دەڵێــی چــی خوشــکێ!!! پیــاو تــووش دەبــێ. هەتــا ســەر بــژی، قوون هەزار نەقڵان دەبینێ.

ئەو نەقــڵانە لە ژیــانی خاڵعەباســدا ئاســایی بــوون. ســاڵێ بەچەنــدین جــار لەوجــۆرە ســەودایانەی دەکــرد. هەمــوو ســاڵێ پــاییز، دەگەڵ نەمــانی کرێکــاری، خــۆی و هاوتەمەنەکــانی، هەمــوو ڕۆژێ، لە گۆشـــەیەکی بـــازاڕ خڕدەبـــوونەوە و بەشـــێوەی

هاوســـــەرۆکی بوورســـــێکی نـــــافەرمی و رانەگەیێنراویـــــان هەڵدەســـووڕاند. هەمـــوو کەلـــوپەل و ئامرازێـــک لەو شـــوێنە بە مەزاد ســەودا دەکــرا. هەر لە کەواوپــانتۆڵ بگــرە هەتــا مەڵەغــان، داس و تەشــوێ، بێژینــگ و داژگیـــر. تەنــانەت نیروئــامووریش. ئەو ئــامرازەی هەوەڵجـــار کە دیــتم پێموابـــوو پاشــماوەی تــۆپی شـــــەڕە، کەچـــــی بـــــابم بە شـــــێوەیەکی نەرم و نیـــــان وەک ئەوکاتــانەی پــوولێکی زۆرم کاسـپی کردبــێ و کـوتبم فەرمــوو بـابە ئەو پـــوولە دەخزمەتـــت دابـــێ، باقێکەشـــی ئیشـــاڵڵا بەزوویـــی دەگــات، بــۆی شــیکردمەوە ئەوە ئــامرازی زەوی کــێڵانە. وەختــی خـــۆی، مانگێـــک، ســـی ڕۆژەی ڕەمەزانـــێ، بەزمـــانی بەڕۆژوو، جــووتم پێکــردووە. بەســتەزمانە وای بەئیشــتیا دەگێــڕاوە پێیوابــوو ئەمـــیش ئێســـتا هەســـتی کـــوڕی نادرشـــام هەیە، لەپـــاش داگیرکردنی هێندووستان بەدەستی باوکی.

خاڵعەبــاس ســەری چووبــا بــازاڕەکەی نەدەچــوو. وەک ئەوەی فەرمـــانبەری حکـــوومی بـــێ، دەگەڵکـــوو ڕۆژ ســـیوادی دەدا، لەو شــوێنە حــازر بــوو. نەک هەرئەو، هەمــوو هاوکــارانی هەروابــوون. بــۆ زۆربەیــان هــیچ قازانجێــک دەگۆڕێــدا نەبــوو، تەنــانەت بــۆ زۆر کــاران وەک شــوان گــرتن، منــداڵ خەتەنەکــردن و شکەســتەبەند، ڕاوێـــژی خۆڕاییشـــیان دەدایەی. لەبـــاری تەمەنەوە زۆربەیـــان بەســاڵاچوو بــوون. ئەگەرچــی لەبــابەت خــاڵ عەباســەوە دڵنیــا نەبـــووم. وەک ئەوەی ئێکســـیری لاوی خـــواردبێ بە درێژایـــی

تەمەنـی مـن، ئەو هەر وەک خـۆی مـایەوە. قەتـی پێخـۆش نەبـوو لە تەمەنــی بپرســی و لەڕاستیشــدا کەس تەمەنــی راســتەقینەی خـاڵ عەباسـی بـۆ یەکلایـی نەبـۆوە. هەرکـات لێـت دەپرسـی خـاڵە چەنـد سـاڵ دەبـی؟ یەکسـەر دەیکـوت: وەڵـڵا پەنجـا سـاڵ تەمەنـی خــۆم وەبیـــردێ. ســەیری باســەکە دەوەدا بــوو کە ئەو قســەم بەدرێژایـی بیسـت سـاڵ هەر بیسـتبوو. یـانی سـی سـاڵ لەمەوبەر هەر ئەو وڵامەی هەبــوو، دە ســاڵ لەمەوبەریــش هەر ئەو وڵامە بوو.

دایکــم دەیکــوت: کــاکم هەوەڵ نــۆبەرەی دەگەڵ مــن شــیری خواردووە، کەچی دوایە بە خولێرکان مردووە.

خــاڵ عەبــاس دەیکــوت: ڕاســت ناکــا، ئەمــن هەر دە ســاڵان لە دایکت گەورەترم.

دایکــم لە دایکــی دەگێــڕاوە کە کوتــوویەتی: ئەگە ســەر بە هەوێ چووم، عەباسم بەجێهێشت، عەباس سەروڕدێنتاش بوو.

خاڵ عەباس دەیکوت: وەبیرم نایە دایکم مێردی کردۆتەوە.

پوورئامــان خوشــکە گەورەی، ئەوکــات کە مــابوو، دەیکــوت: هەرای مەلاخەلیلی، عەباس گوێلکی پێدەلەوەڕا.

خاڵ عەباس دەیکوت: ژن چووزانێ ساڵ چییە!!

دەگەڵ بیســـتنی ئەوهەمـــوو گێـــڕانەوە دژبەیەکانە،ئەژمـــارکردنی خـــاڵ عەبـــاس وەک بەســاڵاچوو، بێدڵنیـــایی دەخســـتە مێشـــکی هەمـــوو چاودێرێـــک. نێـــودێرکردنی وەک بەســاڵاچوو، ڕاســـت بـــێ یـــــــا هەڵە، ئەو وەک ئەنـــــــدامێکی بەردەوام، لەو بورســــــــە وەرگیرابـــوو، تەنـــانەت شـــوێنی دانیشـــتنی تـــایبەتی خـــۆی لەســـەر لێـــــواری شــــەقامەکە هەبـــــوو. بەڵام ســــــەرەڕای ئەو شـــــوێنە کـــــاریگەرەی، وەک زۆربەی هەواڵانـــــی، تەنیـــــا چـــــاودێری زەرەرکەر بـــوو. لەهەمـــوو شـــتێک کـــۆنەکەی پـــێ باشـــتر بـــوو. هەرکە شـــتێکی کـــۆنی دەدیـــت، وەک ئەوەی هەســـتی نۆســـتالژی بزووتبـــێ، ســـەرەڕای لـــۆمەی خـــاوخێزان، یەکســـر دەیکـــڕی و یەکەم شـوێنیش بـۆ نەمایشـکردنی مـاڵی ئـێمە بـوو. بـێ هـۆ نەبـوو. ئەوهەمـــــوو متمـــــانەبەخۆبوونە و تـــــاریف کـــــردنەی دایکـــــم دەمێشکی خاڵعەباسی دەخزاند، ئەنجامەکەی هەرئەوە بوو.

ســـەرەڕای ئەو ڕەوشـــتە تـــایبەتەی، ســـەودای چاکیشـــی دەکـــرد، بەڵام بەفەرموودەی بابم:

- کاک عەباس لەقەدەر قوونی ناترێ.

هەر بـــۆیەش، کـــارە زۆر شازەکانیشـــی لەئاکامـــدا هەر دەبـــوون بە تێڕیان.

بـــۆ مـــن وەک ســـــەیرکەری ڕووداوەکـــان، لەبیرنەکراوتـــرین نمایشـــی بەرهەمە کـــڕدراوە نایابەکـــانی خـــاڵ عەبـــاس، ئەورۆژە

بوو کە بۆ یەکەم جار دیتمی و دەگەڵم پێکەنی، ئەگەرچی دواتر لێم بوو بە بەڵا.

نیوەڕۆیەک، پێش نەهارخواردن، لەپڕڕا دەرکە کراوە و خاڵ عەباس بەلێویکی بەبزە و شتێکی عەنتیکە لە بن هەنگڵیدا لێمان وەژوور کەوت. هاوکات وەک لۆکۆمۆتیوی هەڵمی کە خەریکە هەورازێکی زۆر ئەستەم دەبڕێ، هەورێکی دووکەڵی ئامال شینی جغارەی، دەگەڵ خۆی هێنا ژوورێ. یەکسەر ڕوویکردە بەری چەپی سۆبەکە کە هەمیشە بۆ وی مسۆگر بوو. هەڵبەت هیچ مەبەستێکی سیاسی لە پشت نەبوو. سۆبەی نەوتی تەنیا ئاوڕی لە کەسە نزیکەکان دەداوە، هەربۆیە هەموو لەدەوری سۆبەکە، کۆڕێکمان دەبەست. لای چەپ کاکم دادەنیشت، لای ڕاست بابم. دەیتوانی کاکم دەرپەڕێنێ، بەڵام بابم هەر لە جێی خۆیرا بەخێرهاتنی دەکرد و سەنگەری چۆل نەدەکرد. هەموو ڕۆژێ دەماندیت، هەربۆیە چاکوخۆشێکی وا، نەبوو.

- خاڵ عەباس بەخێربێی.

- خودات لێ ڕازی بێ.

نە زیاتر نەکەمتر. بەڵام ئەوڕۆژە جیاواز بوو. وەبیرم نایە ئایا پێشتر خەونم پێوەدیتبوو یان نا، ئەگەرچی بۆ ئەوەی دەبوو خەونی پێوەببینم. چاکوخۆشێکی زۆر گەرموگوڕی کرد.

هەمـوانی دیـت. تەنـانەت بە پێکەنیـنەوە بە منیشـی کـوت: چـۆنی خاڵە؟

لەبەر عەنتـیکەی بـن هەنگڵـی، ئەوکـات هەسـتم بە گرینگـی ئەو سـاتەوەختە نەکـرد. ئەی خـودا ئەوە دەبـێ چـی بـێ ئـاوا لەو لـێچکە ڕەشـە گـوڵ سـوورەدا پێچـاویەتێوە؟ بەدڵنیـاییێوە دەبـێ شتێکی تـایبەت بـێ کە خـاڵ عەبـاس بە پـێچەوانەی هەمـوو یاسا داڕێژڕاوەکـانی خـۆی، بە نـویژی نیـوەڕۆیە، شـانازی ئەوەی پێداوین بە ئامادەبوونی ئێمە، نمایشی بکا.

هەروا کە خەریـک بـوو جێـی خـۆی لەبـن سـۆبەی گەمـارۆدراو خـۆش دەکـرد، چاوێکیشـی لە هەڵویسـتی خوشـکی ئـازیزی و زاوا ئـازیزترەکەی بـوو کە چـاوی لەسـەر شاشـەی تەلەویزیـۆنەکە هەڵنەدەگـرت. بەخـاترجەمی چـاوەڕێی پرسـیاری کەسـێک بـوو سـەبارەت بەو بـوخچە ڕەشـە گـوڵ سـوورەی، تـاکوو بەشـێنەیی بۆمـانی شـیکاتەوە. ئەوە دایکـم بـوو کە هەمیشـە لەو کـاتە هەسـتیارانەدا بەفریـای دەگەیشـت. بەڵام ئەوڕۆژە بەهـۆی نالەبـاری وەخـتەکە و هاوکـات بـوونی دەگەڵ جەمـی نیـوەڕۆ، دایکـم هـیچ هۆشـی لە دیـارییە شـازەکەی کـاکی نەبـوو و ئەویـش تێکەڵـی ئەو بێهەڵوێسـتییە بەسـامەی ئامـادەبوان بـوو. ئەمـن وەک تەنیـا کەسـی بەهەڵوێسـتی ئەو کـۆڕە، چەنـد جـار بە ئیشـتیا پرسـیارم لێکـرد: ئەرێ خـاڵە ئەوە چیـیە؟ بەڵام نـازانم

نەیبیست یان پێی قارِ بوو جوابم داتەوە و بەبێ ئەوەی دەستم بۆ حەفتا سانتی ئەو بوخچەیەش چووبێ، لەخۆڕا دەیکوت:

- دەستی لێمەدە ڕۆڵە خەرا دەبێ.

پێمـوایە ئەوەش فێڵێکی دیکە بوو بۆ ڕاکێشانی سەرنجی جەماوەر. بەڵام بێ سوود بوو. لە ئاکامدا پاش چەند خولەکێک وەک ئەوەی ئۆقرەی لێ هەڵگیرابێ، بۆخۆی هەڵیدایە:

-دەڵێم ئەرێ خەجێ! ئەوەشم ئەورۆ کڕیوە.

خەجێ بەبێ ئەوەی سەری لەسەر سەبزی چاکردنەکەی هەڵگرێ، هەر لە دوورەوە کوتی:

-ڕەبی مبارەک بێ کاکە! چت کڕیوە؟

خاڵعەباس ئەو پرسیارە بێزەوقەی خوشکی زۆر بە دڵ نەبوو و فەرمووی:

-ئەتۆ وەرە ئێرە، نەدیو، مبارەکی چی.

دایکم لە شێوازی کوتنی خاڵعەباسڕا، هەستی بە هەستیاری بابەتەکە کرد و گورجێک خۆی گەیاندە کاکی کە خەریک بوو ڕوونوێنی لەو بەرهەمە نوێیە دەکرد و تارای ڕەشی گوڵ سووری لە سەر دادەماڵی.

-دادەی! ئەوە چییە کاکە؟ چەندیش لەبارە! ئەو زەفتە جوانت کەنگێ کڕیوە؟ حەک ڕەبی موبارەک بێ. شتی چاکتری بە دوودا بێ. ئەوە چەندت پێداوە؟

بۆ وڵامدانەوەی پرسیارە بێ ئەژمارەکانی دایکم، خاڵعەباس کە ئێستا فیکەی سمێڵانی دەهات، بە دەمێکی پڕپێکەنین، چووە سەر بەشی داخوازی خۆی:

-ئەو بەیانییەی لە وەستا ئەحمەدم کڕی. پووڵی پێویست بوو، هەرزانم لێ ستاند. چاولێکە شەریکەی حەسڵە. هەرکاری نەکردووە.

-دادەی! ئادی، وەڵڵا ڕاست دەکەی.

نەمدەزانی شەریکە چییە تاکوو بۆم ڕوون بێتەوە ئەو ڕاستکردنەوەی دایکم بۆ شەریکەیە یا خاوێنی زەفتەکە.

بابم کە وەک هەمیشە چاوی لەسەر شاشەی تەلەویزیۆنەکە بوو و گوێی لە وتووێژەکان، گورگ ئاوڕێکی داوە و کوتی:

-کارێش دەکا؟

خاڵ عەباس وەک ئەوەی گیشەت لێ ئاور تێبەردابێ، بەوپەڕی قەڵسیوە کوتی:

-چۆن کارێ ناکا؟ جا ئەوە قسەیە دەیکەی؟

دایکیشم بۆ پشتیوانی کاکی کەوتە هەڵوێست وەرگرتن.

-ماڵتە قسەی وا دەکا، منداڵ نایکا.

ئەو قسەیەی بابم ئەگەرچی بۆ سووککردنی زەفتەکەی خاڵم بوو، بەڵام شتێکی پێچەوانەی پەیڕەوی ناوخۆی ئەو جۆرە دانیشتنانە نەبوو. ئیدی نازانم بۆ خاڵ عەباس هێندەی لە دڵ گران هات.

لەو بەینەدا کە دایکم خەریک بوو بە چاووبرۆیان پیلانی دواتری بۆ بابم ئاشکرا دەکرد، خاڵ عەباس دەستێکی دەبەر پشتێندێ نا و لە گیرفانی هەرە خواریێ کەواکەی، لە نزیک شوێنە هەستیارەکان، سیمێکی بۆری چڵکنی، دەرکێشا.

ئەو گیرفانەی ئەو سیمە چڵکنەی تێدابوو، ئەگەرچی زۆربەی قەدیمییەکان گیرفانی لەوجۆرەیان هەبوو، بەڵام شتێکی ئاسایی نەبوو. زۆر تایبەتمەندی هەبوو کە لە گیرفانی دیکەدا بەدی نەدەکرا. یەکەم، هیچ کەس بۆی نەدەکرا ئەو گیرفانە ببڕێ، مەگەر ئەوەیکە خاوەن گیرفانیش دەگەڵ خۆی بەرێ. دووهەم، ئەو شوێنە جێگەی هێندێک ئامراز و کەرەسە بوو کە پێویست نەبوو هەمیشە لەبەر دەستان بن بەڵام بوونیان پێویست بوو. لەو گیرفانەدا چەقۆی زامندار، مقەستی بەرسمێڵان، نینۆکگر و ئاوێنە پەیدا دەبوو. بەڵام دەکرا بەپێی داخوازی خاوەن گیرفان ئایتێمی دیکەی بۆ زیاد بکرێ.

ئەگەرچی بەهۆی ئەستەم بوونی دەستپێڕاگەیشتنی، بۆ زۆر شتی وەک قەرەپووڵ نەدەبوو. بەڵام هەر ئەوەیکە خاڵ عەباس سیمی زەفتەکەی دەوێ نابوو، مانای ئەوە بوو کە ئەو زەفتە لەلای خاڵعەباس زۆر پڕبایخە.

خاڵعەباس بۆ ئەوەی گەرماوگەرم دژی بابم بوەستێتەوە، خێرا سیمەکەی لە پشتی زەفتە بۆری دا.

-دا هانێ کوڕە! بیبە لە بڕقی دە.

نەک ئەوەی کە قەتم زەفت نەدیتبێ، دیتبووم، بەڵام عەنتیکەی ئاوام قەت نەدیتبوو. هەر بۆیە بەوپەڕی خۆشحاڵێوە، هەڕامکردە زەفتە بۆر و پڕم پێداگرت. بەڵام وادیاربوو زەفتەکە پڕی بەمن داگرتووە، بەجۆرێک کە یەکسەر ئامبازی بووم و کەللە سەری تازە تاشراوم، بەوپەڕی توندێوە دە سووچی زەفتەکە کوتا. خەتای من نەبوو، زەفتەکە زۆر قورس بوو، نەدەبزووت. بۆ ساتێک بەبیرمدا هات کە قورسی زەفتەکە دەبێ پێوەندییەکی بە وشەی شەریکەوە هەبێ کە پێشتر باسی کرا. بەڵام هێشتا سەرم هەڵنەهێنابۆوە و هیچ زانیارییەک لەسەر ڕادەی خەسارەتەکە ئاشکرا نەببوو کە چەپۆکی دایکم، ئامبازی شەریکەی کردمەوە.

-ئەی سەرت دە قوڕێ نێی! بابانت خەرابێ! خۆ زەفتەکەت شکاند.

هەرکە بە چەپـــۆکی دایکـــم ســـەرم بـــۆلای زەفـــتەکە دەوری هەڵگـــرتەوە، تونـــد چـــاوم قوچانـــد، تـــاوەکو بەرگەی ئێشـــی دووبـارەی ئەو وێککەوتـنە نامبـارەکە بگـرم، کەچـی خـاڵ عەبـاس، خـودای لـێ ڕازی بـێ، یەک و دوو، زەفـتە بـۆری ڕاگوێسـت و لە ئـــامێزی گـــرت. ئەگەر چـــی ئەوەی دەبـــا لە ئـــامێز گیرابـــا و ژێرکراباوە زەفتەکە نەبوو.

خـــودا بە نەســـیب دوژمنـــی نەکـــا. نێـــوانی هەردوو چـــاوم، ســـێ قامـــک ســـەرتر، بە مەزەنـــدەی ئێســـتا، جێـــی حەوت گـــاوان، وا هەڵـدڕا کە ئێسـکی سـپی وەدیـار کەوت. دیـارە ئەوکـات، خـوێن دەبـا بۆخـۆی ویشـک بووبـا و نەخـۆش و برینـدار هەتـا چـاوی بزوتبـان، ئومێـدێک هەر هەبـوو و پێویسـتی بە دکتـۆر و دەوا و دەرمـان نەدەکـرد. شـکور بۆخـودا ئەمـن کـارم نەگەیشـتە چـاو بـزووتن و لە سایەسـەری سـووتە سـیگاری خـاڵ عەبـاس و تفـی دایکـم، خـوێن هەر زوو ڕاوەسـتا. شـوێنی بـرینەکە وایکـرد تـا مـاوەیەک مامۆسـتاکانم بە گـای قەشـانیان دەشـوبهاندم. دیسـان هەر باش بوو، خودا ڕوحمی کرد زەفتەکەم خوێناوی نەکرد.

دوابەدوای ئەو زنجیرە ڕووداوە دایکم هەستی بزووت.

-حەک ڕەبـی دایکـت کـوێر بـێ! فەقیـرە مـرد. حەک دەسـتم شکێ! ئەمن ئەو چەپۆکەم بۆ پێدادا!

نـــازانم بـــۆ لە مـــاڵی ئـــێمە هەمیشـــە کارەکـــان دەکـــران، دوایە فکرەکـــان دەهـــاتن و لە پـــاش هەمـــوان، هەســـت و ســـۆز، بە لەنجەولار سەرەقوتەیەکیان دەکرد.

خـــاڵ عەبـــاس کە بەوردی پشـــکنینێکی تەواوی بـــۆ زەفـــتەکەی کردبـوو و لە ساغبوونی دڵنیـا ببـوو، ئێسـتا دە هەوڵـی ئەوە دابـوو، زەفـــتە بـــۆری بکـــاتەوە ئەجێنـــدای کۆبـــوونەوەکە، هەر بـــۆیە بە بزەیەکی بێ هەستەوە کوتی:

-هـیچ نیـیە ڕۆڵە مەگـری، خەتـای تـۆ نیـیە، ئەو زەفتـانە هەروا قورســن. حەســڵ ژاپــۆنن بــۆیە وان. پێــت وایە وەک ئەو زەفــتە پیســانەی ئێســتا دەچــن. ئەوە دوو شــریتان دەخــوا. یەک دەیلــێ، یەک زەفتـی دەکـا. پێـت خـۆش بـوو ئەوە بیلـێ، دەنـا نـا، بـا ئەوە بیلـــێ. ئەگەر هەر حەزت لێـــی نەبـــوو، بـــیکە بە ڕادۆ. کوێـــت پێخۆش بوو بیگرە. جا چاو لێکە.

هاوکـــات دەگەڵ دەربڕینـــی زانیـــاری ورد و درشـــت، تەنیشـــتی چەپــی ســۆبەی بــۆ منــی تــازە ژیروەبــوو جێهێشــت و چــوو لە تەنیشـــت کـــونی کارەبـــا دانیشـــت. ســـیمی زەفـــتەکەی دە کـــونی کارەبـا ڕۆکـرد و هەڵیکـرد. هەرکە تەزووی کارەبـا، بـۆ زەفـتە بـۆر جـــاڵەبۆوە گرەگـــرِ پەیـــدا بـــوو. بە متمـــانە بەخۆبـــوونێکی زۆر، گەڕێــک هەتــا ســەر بایــدا. کە دیتــی هــیچ دەنگێکــی لێنــایە، ئەوجـــار بە شـــێنەیی گەڕانـــدیۆە, کەچـــی دەگەڕانەوەشـــدا هـــێچ

باس نەبوو. چاوەڕوان دەکرا لە بارودۆخێکی ئاوا، پەیکەری متمانەی، زوو جرچی تێکەوێ، بەتایبەت کە ئێستا، بابیشم تەلەویزیۆنەکەی قەپات کردووە و سرنجی تەواوی خستۆتە سەر خاڵعەباس. بەڵام بەپێچەوانەی چاوەڕوانی خاڵعەباس، ئەوجار بابم نەک وەکوو لۆمەکەر، بەڵکوو وەک هۆگرێک، هاتە پێش و کەوتە یارمەتی.

- کاکعەباس مۆجەکەی بگۆڕە.

هەوڵ و تێکۆشانی ئەو دوو کۆڵنەدەرە لەسەر مەوجی دووهەم پێداگرانەتر بوو و لێی هەستابوونە سەر چۆک. ئەگەرچی مۆجی دووهەمیش سەراسەر گەڕان و هیچیان نەدیتەوە.

ئاخری بابم پاڵی لێداوە و کوتی:

- کاک عەباس ڕادۆکەت نایڵێ، لێی گەڕێ، شریتێکی تێهاوێ.

بەڵام خاڵ عەباس لێی ببوو بە کوردەناموسی و دەستبەردار نەبوو، تەنانەت پەنای بردە مۆجی سیهەم و چوارەمیش. ئەوانەی کە لەسەر زەفتەکۆنەکەی خۆمان، هەموو جارێ بابم لە وڵامی پرسیاری من دا دەیکوت:

- ئەوانە هیچ نین.

مـۆجی سـێ بـوو یـا چـوار نـازانم، ئەوەی کە زۆرگرینـگ بـوو، ئەوە بـــوو دەبـــا دەنگێکـــی هەر دیتبـــاوە و لە ئاکامـــدا ئەوەنـــدەی سـووڕاند، تـا دەنگێکـی دیـتەوە. لەسـەرەتادا لەبەر لەرزی دەسـتی بـۆی ڕاسـت نەدەبـوو. ڕاسـت لەو جێـیەی کە دەبـا ڕایگرتبـا، قـامکی گەورەی جیفرکـی لەخـۆی دەدا و ئـاوەژووی ئەودیـوی دەکـرد. بەڵام بە پێـداگریێکی زۆر ڕاسـتی هەر کـرد. لەو کـاتەدا وەک بـــراوەیەک، بە زەردەخەنە ســـەری لەســـەر زەفـــتەکە هەڵبڕی و کوتی:

-دایکی خێوی ..... جا چۆن نایڵێ!!!

ئەگەرچـی دەنگـی سـەرکەوتنەکەی بـۆ گـوێی ئـێمە، زۆر نـامۆ بـوو، بـۆ مـاوەیەک هەموومـان بە بـێ ئەوەی هیچـی لـێ تێـبگەین گوێبیســـی بـــووین. بەڵام لە درێـــژەدا بە هەســـت پێکردنـــی بێکەڵکـی ئەو کـارە خەریـک بـووین تـامی زارمـان بـۆ دەربڕینـی بیرۆکەکـان و ڕا گـۆڕینەوە خـۆش دەکـرد کە لەپـڕڕا، یەکەم وشـەی ئاشـنا، کە (بەغـدا) بـوو لە زاری وێـژەر دەرپەڕی و بـابم و خاڵ عەباسی لەسەر یەک ڕستە کۆک کرد.

-دا بێدەنگ بن بزانین دەڵێ چی!

هەڵـبەت هێشـتا کەس قسـەی نەکردبـوو و ئەو ڕسـتەیە تەنیـا ئاگادارکەرەوە بوو.

بەغـدا بـوو بە ڕەمـزی عەمەلیـات و هەردوو لێـی چـوونەوە پـێش و دووبەدوو سـیرەیان لە زەفـتە بـۆر گـرت و گوێیـان هەڵخسـت. لەدرێـــژەدا هەر بەوەنـــدە نەوەســـتان و جارجـــار ســـەریان وەک ئامـــاژەیەک بـــۆ ڕاســـتی بابەتەکـــان، دەلەقانـــد. بە چـــاویش یەکتریان تێدەگەیاند کە وادیارە باسەکە زۆر هەستیارە.

لـوتکەی باســەکە ئەوکـاتە بـوو کە وێـژەر لە گەرمەی قسـەکانیدا بە دەنگێکی پڕحیماسەتەوەکوتی: قائدنا الصدام الحسین.

لەوکـاتەدا ئەو دوو مامۆســتا عەرەبــی زانە، وەک ئەوەی بیـــنەری ڕاســـتەوخۆی کردەوەیەکـی تیرۆریسـتی بـن، لێکـرا ڕمبێـک بڵینـد بـوون و دەنگـی ئەهـا ئەهـا!!! یـان وەسـەر دەنگـی وێـژەر کەوت. ئەو کـــاردانەوەیە بـــوو بە ئامـــاژەیەک کە بێـــدەنگی ئامـــادەبووان، هەتـا کـاتێکی نادیـار، دەبـێ پـارێزراو بـێ، چـونکە باسـەکە زۆر گرینگە.

لەبەر هەسـتیاری بـابەتەکە بـێ یـا ترسـمان، بـۆ مـاوەیەکی زۆر بێـــدەنگ دانیشـــتین و چاومـــان بـــڕییە زەفـــتەکە و بەبـــێ ئەوەی کەســمان عەرەبــی زان بــێ، گوێمــان بــۆ بابەتەکــان ڕاگــرت. نە بــابم و خاڵعەبــاس نەهاریــان لەبیــر بــوو نە ئــێمە وێرامــان داوا بکەین.

لەئاکامـدا نـاوبڕی بابەتەکـان کە پـارچە مـوزیکێکی نـامۆ بـوو، بـوو بە فریشـــتەیەک تـــا لە کـــۆڵ ئەو بێـــدەنگییە بە ســـامە ببیـــنەوە.

بەوجـۆرە دەرەتـانێکیش بـۆ گـوێگران ڕەخسـا تـا هـیچ نەتاسـێن و بەبێ شەرمەزاری، خۆ لەو هەوڵە کولتوورییە بدزنەوە.

خـاڵ عەبـاس هەرکە دڵنیـا بـوو لە لاچـوونی تیژایـی سـرنجی ئامـادەبووان لە سـەر زەفـتەکە، خێـرا کوژانـدیەوە و هاوکـات کە خەریـک بـوو سـیمەکەی بـۆ جێگـرتن لە گیرفـانی تـایبەت ئامـادە دەکرد، دەستیکرد بە ڕاڤەی بابەتەکە:

-پێموایە دەڵێ سەددام خەریکە هێرش دێنێتەوە.

- ئەیارۆ!!! هێرشی چی کاکە؟

- ئەی دێـتەوە چـۆن. پێیـدەکرێ پـێ! وەڵـڵا ئەوجـار هەتـا ئەولای تارانیش دەڕوا، لەوانەیە بگاتە شیرازیش.

- جا خۆ خاڵە بۆ سەددامی شیراز لەپێشترە.

- پێشـتری چـی هەتیـوە. ئەتـۆ چـووزانی! شـیراز ڕێگـای دوازدە ساعەتان لە تارانێ دوورە.

پێویسـت نەبـوو بـۆی شـیکەیەوە کە سـەددام بە ئوتووبووسـی کرماشـان تـاران، نـاچێ بـۆ شـەڕ, چـونکە لەئانوسـاتدا بـابەتەکەی دەگـۆڕی و وێـژەر وەک داعبـای نیـوەزەڕ لە نێـوانی مەنتـق و خاڵعەباسدا دەماوە.

- وەڵــڵا ڕۆڵەیە. ڕەحــمەت لەو دایــکەی لێــی بــووی. هەتــا دنیــا دنیایە دایک دانانیشێتەوە ڕۆڵەی ئاوای ببێتەوە.

ئەوکــاتە، ســەرەڕای ئەوەی خــاڵ عەبــاس خەریــک بــوو بە پــێچەوانەی هەمــوو یاســا نەنوســراوەکانی بــابم، لە مەیــدانی سیاســەتدا مەیدانــداری دەکــرد، بــابم هــیچ بەرامــبەری نەوەســتاوە چــونکە بە دڵنیــاییەوە ئەوەنــدەی وەبیــرم دێ، تەنیــا شــتێک کە بــابم و خــاڵ عەبــاس هەمیشــە لەســەری کــۆک بــوون ســەددام بوو.

خاڵعەبـــاس شـــەیدای کەســـایەتی ســـەدام بـــوو و بەردەوام ستایشــی دەکــرد. بە ئــاوات بــوو منــداڵێکی بە نێــو بکــات بەڵام ئەوکـات کوڕەکـانی گەورە بـوون و خێزانیشـی توانـای بەدیهێنـانی ئەو ئـــاواتەی نەمـــابوو، هەربـــۆیە دواتـــر بەزۆری زۆرداری، نەوەیەکـی نێونـا حوسـێن و لە هەمـوو شـوێن و دانیشـتناندا باسـی دەکـــرد. دوای وەرگەڕانـــی دەســـەڵاتەکەی ســـەددام و گەشــەکردنی ڕاگەیانــدن و گێــڕانەوەی کارەســاتەکانی ســەر کــوردان بەدەســت ســەددام، خــاڵ عەبــاس وەک بیــنەری بەردەوامــی ئەو ڕاگەیانــدنانە، تەواو بیــروڕای گۆڕابــوو. ببــوو بە زرڕدایکی سەددام و جندی لێهەڵدەدا.

جارێــک کە لە دانیشــتنێکی بــنکە فراوانــدا، خەریــک بــوو بە حیماســەتەوە، بەوپەڕی ڕق و بێــزاری، بەزمــانی تــایبەتی خــۆی سوڕی لێ دەدرکاند و جنێوی پێدەدا، یەکێک کوتی:

-ئەدی خــاڵ عەبــاس ئەگە ســەددامت پــێ خەراپە، بــۆچی نەوەکەت بەنێو کردووە؟

خــاڵ عەبــاس بە بــێ ڕەچــاوکردنی سیاســەتی ســەبرێک و دوو فــوو و بەبــێ ئەوەی لە زەبــری حیماســەتەکەی کەم کــاتەوە، فەرمووی:

-هەرسێک تەڵاقم کەوێ درۆیە دەکەی، قەت وانەبووە.

ئیــدی ئەو دۆســییە بەو جــۆرە بەســرا و لەو ســاتەوە تــا کۆتــایی ژیانی پرشکۆی، کەس نەیوێرا ئەو بابەتە بورووژێنێتەوە.

ئەو زەبــر و حیماســەتە لە گفتــولفتی خاڵعەباســدا ئاســایی بــوو. لەڕاســتیدا ئەو قەت دەگەڵ حیماســە نــامۆ نەبــوو و دەکــرێ بــوترێ بەشــێک لە کەســایەتی ئەو بــوو. لەوانەیە ئەویــش وەک زۆر شــتی تــر، میراتــی قۆنــاغێکی تــایبەتی ژیــانی بــێ. ئەو قۆنــاغەی وەک ئەکتەرێکــی چــاک، ڕۆڵــی دۆن کیشــۆتێکی خۆمــاڵی بە باشــی گێــڕا و بە حیماســە ئاشــنای کــرد. ئەو قۆنــاغەی خــاڵ عەبــاس، چیرۆکەکــانی ژیــانی شۆڕشــگێڕی خــۆی لــێ هەڵــدێنجا. شۆڕشــگێڕییەک کە دواتــر خــاڵ عەبــاس لەســەر بنەمــای پێــنج وشــە شــیکاری بــۆ دەکــرد: هەرچــی عەجەمە

دەوڵەتە، ئاغـــاش خەراپـــن. ئەگەرچـــی لەڕاســـتیدا هیچکـــام لەو وشـانە، هـۆی بـوونە شۆڕشـگێڕی خـاڵ عەبـاس نەبـوون. هۆکـاری ڕاست، قسەی بابم بوو کە دەیکوت:

- کـاک عەبـاس بە بارێـک ڕەژی و لوشـکە ئێسـترێک بـوو بە شۆڕشگێڕ.

ئەو قسـەیە ئەگەرچـی شـێوازی گێـڕانەوەی گاڵتەئـامێز بـوو و بە زاری دژبەرێکـی ڕق ئەسـتووری خـاڵ عەبـاس کـوتراوە بەڵام بەدڵنیـاییێوە ڕاسـتە. لە بـابەت ڕەژی ئەگەرچـی دڵنیـا نـیم بەڵام پێمـوایە لوشـکە ئێسـتر دەتوانایـدا هەیە گۆڕانکـاری گەورە بقەومێنـێ. هەروەک چـۆن ڕەخشـی ڕۆسـتەم بە لوشـک و قەپـاڵ شـێری کوشـت و گیـانی ڕۆسـتەمی پاراسـت و فێردۆسـی یارمەتیـدا کە خۆبپـارێزێ لە نووسـینی ئەفسـانەیەکی دیـکە کە تێیـدا رۆسـتەمی نووسـتوو، بەدەم خەوەوە، شـێرێکی زەلامـی زەبەلاح بەنووکی شێرەوە دەکا.

ئۆسـتوورەکان هەرئـاوا سـازدەبن، بەمەرجێـک کە هـیچ بینەرێـک جـگە لە قارەمـانی چیـرۆکەکە یـا لایەنگرانـی نەتـوانن ڕەوتـی ڕووداوەکە بگێـڕنەوە. هەر بـۆیە دەکـرێ بـوترێ ئێـرە دووڕێیـانییەکی سـەختە کە ئایـا بـۆ خـاڵ عەبـاس، بەپەرۆش بـین، یـا خۆشـحاڵ بـین بە دەستڕاگەیشـتنمان بە ڕاسـتی ڕووداوەکـان. هەرچەنـدە پێمـوانییە خـاڵ عەبـاس پێویسـتی بە پەرۆشـی کەس

هەبـــووبێ، نەک لەبەر ڕەوشـــتی تـــایبەتی، بەڵکـــو لەبەرئەوەیـــکە هـیچ کەس نەبـووە بـوێرێ بە حەیـاتی خـۆی، دەقێکـی جیـاواز لە دەقـــی فەرمـــی لە حـــزووری جەنابیانـــدا بگێـــڕێتەوە و ئاگـــاداری گێڕانەوە جیاوازەکەی بکا.

- هەمـــوو ڕۆژێ بـــاری خـــۆم لێـــدەدا و بەپـــێش چاویانـــدا دەهاتمەوە.کاریـــان پـــێم نەبـــوو. نەک بڵێـــی کاریـــان بە کەس نەبـوو، نانـا کـوڕە ئەودەمـی شـەبکە تونـد بـووا! کەڵ بە مـوو بەنـد بوو. ئەمنیان دەناسی، دەیانزانی لە قەدەر خۆم شتەکەی دێنم.

هەرکە دەگەیشـــــتە ئەو بەشـــــەی گێـــــڕانەوەکەی، وەک ئەوەی بڵێـــی لە مێشـــکی خۆیـــدا بە گێڕانەوەکـــانی پێشـــووتری بەراورد بکـــا، وەســـتانێکی کـــورتی دەکـــرد. چـــاوی لەســـەر گـــوێگران هەڵـــدەگرت و بە شـــێوەیەکی شـــاعیرانە دەیـــڕوانییە دوور. ئەگەریـــش جغـــارەی تـــووتن‌وپەڕی بە دەســـتەوەبا مژێکـــی قـــووڵی لێدەدا.

-ڕۆژێکـی یەکـی ڕەقـی، چرچـی، درێـژم لـێ پەیـدا بـوو. نیوەڕاسـتی ڕێـیەی لێگـرتم. حەتـمە هەر دەبـێ قۆڵبەسـت کرێـی. ئەوانـی دی دەیانناسـیم، گـوێم لـێ بـوو بە عەجەمـی دەیـانکوت ئەوە پیـاوێکی سـەداقەتە لێـی گەڕێ بـا بـڕوا. ملـی نەدا. بە سـەری تـۆ ڕۆبـووە چەکەکەی، سیرەی لێگرتم.

وەبیـــرم نـــایە قەت ئەو بەشـــە لە چیـــرۆکەکەی یەک جـــوور بـــووبێ. هەمیشـــە بەپێـــی بـــارودۆخی مەجلیســـەکە، گۆڕانکـــاری بە ســـەردادەهات. جـــاری وابـــوو ســـیرەی لێـــدەگرت. جـــاری وابـــوو زلـــلەی لێـــدەدا و ئەگەر شـــەو درەنـــگ گێڕابـــایەوە، ئەوە زۆری ئامۆژگاری ژاندرمەکە کردووە.

- وەڵـــڵا بە ســـەری تـــۆ ئەمـــیش هـــیچ نەتاســـام، خـــۆم دە قەراغ ڕێـــیە هاویشـــت. چـــاردەخۆرێکی چـــاکم پێبـــوو، لەبەر پشـــتێندێم دەرکێشـــا، دوو فیشـــەکم بەســـەردا هەڵتۆقانـــد. کـــاکە بـــوو بە ڕۆژی حەشر. هەر ژاندرمە بوو هەڵدەهات.

ئەوە و چەنـــد جـــۆری دیـــکە، گێـــڕانەوەی تـــایبەتی ئەوی بـــوون. خاڵعەبـــاس یـــا نەیـــدەزانی کە هەمـــوو کەس دەزانـــێ، یـــا لە خـــۆی دەگـــۆڕی کە دوو ڕۆژ دواتـــر ژانـــدرمە، ڕایـــان ســـپاردبوو کە پووڵێـــک بێنـــێ ئێســـترەکەی دەدەیـــنەوە. ئەو تەنیـــا نیـــوەڕۆژێکی پێویســـت بـــوو، ئـــاوەژووی ئەودیـــوی ســـنوور بێـــتەوە. ئەوکـــاتیش نەکەس هەبـــوو دەخەمـــی دابـــێ و نە کەس ســـوراغی دەکـــرد کە پێـــی بڵـــێ، کـــاکە وەرەوە خـــۆ بـــۆ ڕەژی هەڵتناوەســـن. دیســـان خـــۆ خەتـــای تـــۆ نەبـــووە، ئێســـترە، بەســـتەزمانە، لوشـــکانیش داوێ، دەســـڵەمێتەوەش. بـــا لوشـــکی لە بەر زگـــی ئەســـپی ژانـــدرمەش دابـــێ، بـــا ژاندرمەشـــی لە ســـەر ئەســـپی فڕێـــدابێ، بـــا جڵەویشـــی بەدەســـت تـــۆ بـــووبێ، خـــۆ هیچـــی لێنەهـــاتووە. بەرتیلـــی خـــۆت بـــدە و قیت هەڵپەڕە.

ئەو لێکـدانەوە بـێ سـوود بـوو. لوشـکە ئێسـترێک ژیـانی خـاڵ عەباسـی گـۆڕی و کـردی بە شۆڕشـگێڕی خەیـاڵاتی خـۆی. لە بـێ بەختـی خـاڵ عەبـاس، ئەو لوشـکە ئێسـترە هاوکـات بـوو لە گەڵ ئاڵۆزییەکـانی پـاش ئیسـلاحات. هەر بـۆیە بەبـێ ئەوەی بزانـێ چ باسـە، بـۆ مـاوەیەکی کـورت تێکەڵـی ئەو ئاڵۆزییـانە بـوو و خـۆی لـێ قـاییم کـردن، هەڵـبەت بەهـۆی چەنـد کەسـی خـۆولاتی و بەتـایبەتی جیـران دێ. هەر ئەوانەی دواتـر لێـی بـوون بە شـەهرزاد و چیرۆکـی هەزارویەک شـەوی ژیـانی شۆڕشـگێڕی خـاڵ عەباسـیان، وەک شـەوچەلەی کـۆڕ و شەونشینیەکان دەگێڕاوە.

بەهـرەی خـودا پێـداوی خاڵعەبـاس لە ڕاهـاتن دەگەڵ هەمـوو بارودۆخێـک، یارمەتیـدەری بـوو بـۆ ئەوەی، نەک وەک ئـاوارەیەک، بەڵکـوو وەک خـاوەن مـاڵ، دەگەڵ ئەو دۆخە نـوێیە، هەڵسوکەوت بکا.

- هەر وەک لە مـاڵە خـۆم بـم وا بـوو. هەمـووی دۆسـت و بـرادەر بـوون. زۆریـان بەخێـر هێنـام و دەستخۆشـیان لێکـردم. وەڵڵا ئیدی لەوێ گیرسامەوە.

لە ئاسـت خـاڵ عەبـاس هەمـوو وشـەیەک دووبـارە ناسـاندنی پێویسـت بـوو و پـێش هەمـوو داواکـارییەک پێویسـت بـوو بـۆی

شـــی کەیەوە کە مەبەســـتی ڕاســـتەقینەت چیـــیە، دەنـــا ئەو بە شێوەی خۆی، بۆی لێکدەدایەوە.

بـۆ هاوڕێیـانی هێنـدێک کـاتی پێویسـت بـوو هەتـاکوو بە ئەم ڕاســتییە بــزانن و لە قەدەر خــۆی بــۆ هەر ئەرکێــک ڕایســپێرن. ڕایان سپارد:

-کـاک عەبـاس، چەنـد ڕۆژێـک لەو دێـیە بمێـنەوە چـاودێری ئەو چوارکەسە بکە هەتا دەگەڕێینەوە.

کەچـی خـاڵ عەبـاس بۆخـۆی وای لێکـداوە کە بەڵـێ، ئێسـتا ئەو بەرپرســـی زینـــدانەکانی ئەو شۆڕشـــە چینـــایەتییەیە. هەر وەک دەیگێڕاوە:

-بەســەری تــۆ ســێ مــانگی ڕەبەق، بەتــاقیتەنێ، بەســەر زینــدانان ڕادەگەیشتم، هێندەی تێدابوو هەر جمەی دەهات.

لە حەوســەلەی کەســدا نەبــوو شــک لە ئەژمــاری کات‌وکەســی ئەو ڕووداوە بکـا چـونکە لە ئاکامـدا باسـەکەی وا بەلارێـدا دەبـرد کە کەم کەس بۆی ساغ دەبۆوە، لە سەرەتادا باسەکە چ بووە.

-کـوڕە بـابم!! ئەودەمـی بـۆ وەک ئێسـتا بـوو، کـێ دەیزانـی ڕۆژ و ســاڵ چیــیە. پیــاو دوو مــانگی درویێــنە دەکــرد ڕەنگــی ئــاوی نەدەدیـــــت. دەگەڵ مەلا دەیکـــــوت الـــــلە اکبـــــر ئەوە وەدەر دەکەوتــی، هەتــا ئەســتێرە وەدیــار دەکەوت. ئەدی چــۆن کــاکە.

بەخـودای جووتێکمـان گـا هەبـوو جـووتی ئەو دێـیەم پێـدەکردن مەنزووریـان نەبـوو. ئـاخری ئاغـا بە زۆری لێـی سـتاندین. بـۆیە دەڵێم ئاغا... .

و هەروا درێـــژەی هەبـــوو هەتـــا کـــونی باســـەکەی لـــێ کـــوێر دەکردێـــوە و ســـەری لێدەشـــێواندی. قەت خـــۆی زەحـــمەت نەدەدا لە هەســـتی گـــوێگری ئاگـــادار بـــێ، لەکاتێکـــدا زۆربەی گێڕانەوەکـــانی، لە مـــاوەیەکی کورتـــدا، دژبەیەک دەردەچـــوون. تەنیـا خـاڵی هاوبەشـی گێڕانەوەکـانی، بـوونی زاتـی پیـرۆزی لەو کات و شوێنە بوو.

لە ڕاسـتیدا بە ئەو ئەرک وەخـۆگرتنە، خـاڵ عەبـاس هەسـتی بە بەرپرســیارەتییەکی زۆر کــرد. بیــر و هۆشــی تەواو چــووە نێــو نــاخی بــابەتەکەوە و بەتەواوی تــێکەڵاوی ڕۆڵــی خــۆی بــوو. ئەو بە لەخـــــۆبردووییەکی لەڕادەبەدەر، ئەرکەکـــــانی ڕادەپەڕانـــــد و شـــەو و ڕۆژی تەرخـــان کردبـــوو بـــۆ پارێزگـــاری لە زینـــدانی و زیندان.

- بە قەبــری ئەو بــابەم ســەری وێکــردووە، بە ســێ ڕۆژ، چــاوم لەســـەر یەک دانەدەنـا. ئەو زینـدانە تەحـویلی مـن بـوو. خـۆ نەدەکرا بەڕەڵڵای کەم، گوێی نەدەمێ.

زینـــدانێک کە زۆرتـــر لە شـــوێنی دێوەزمـــان دەچـــوو. ئـــاغەڵێکی دوورە دێ، کە بە مـــۆرە ســـازکرابوو. چـــۆل کرابـــوو و دارمـــانی لە

ئـــان و ســـات دابـــوو . پەلە ســـوانی وا داچۆڕابـــوون، دەتکـــوت چـــاوەڕوانی یەکەم بـــارانی پـــاییزی دەکەن هەتـــاکو بە دیـــداری ئەرز، شادوشـــکور ببـــــنەوە. دارەڕاکەی لە زۆر شـــــوێنی، پـــــاش ســـاڵانێکی زۆر، چاویـــان بە دیتنـــی خۆرەتـــاو ڕوون ببـــۆوە و ببـــوونە شـــوێنی هـــێلانەی پاســـاری و ڕمبـــازێنی تـــوولە مـــاران. لەمێـــژ بـــوو کەس ڕووی تێنەدەکـــرد. تەنـــــانەت وەک شـــــوێنی جنـــــدووکان، ببوو بە ئامرازی ترساندنی منداڵانی لاساری ئاوەدانی.

ســـەرەڕای ئەو گـــرفتە تـــۆقێنەرە، وەک خـــۆی دەیکـــوت، خـــاڵ عەبـــاس بەرپرســـیارێتی ئەو کۆشـــکی جنـــدووکانەی زۆر بە هینـــد وەرگرتبـــوو و ئەو شـــوێنە بـــۆ وی شـــوێنێکی ســـتراتێژیک بـــوو. بـــۆ گەیشـــــتن بە ئامـــــانج، هەمـــــوو ئـــــامرازێکی بە ڕەوا دەبینـــــی و لەبـــارەی ئاکـــامی هەڵســـووکەوتی خـــۆی هـــیچ نـــیگەران نەبـــوو. لە کاتێکـــــدا زۆربەی خەڵکـــــی ئـــــاوەدانی، لەترســـــی تـــــۆڵەکردنەوەی دواتـــر، خۆیـــان پێشـــانی ئەو دەرەبەگە زینـــدانیانە نەدەدا، بـــۆ خـــاڵ عەباســـی گرینـــگ نەبـــوو ئەوانە کـــێن؟ چ کـــارەن؟ بـــۆ گیـــراون؟ هەربـــۆیە وێـــڕای ئازاردانیـــان، یەکـــدا یەکـــدا ســـینگی دێنـــا پـــێش و دەیکوت:

-دەڵێم ئەمن، عەباسی مرۆتێم پێدەڵێن!

عەباســـی مرۆتـــێ، کە پاســـەوانەکانی زینـــدانەکانی گێشـــتاپۆی نـــازی، لەبـــابەت تازەگەرییەکـــانی لە بـــواری ئەشـــکەنجەدان،

ئێرەییـان پێـدەبرد، بەوپەڕی ماندوونەناسـی خەریـک بـوو هەمـوو شـێوە تاقینەکراوەکـانی ئـازاردانی زینـدانیانی، بە پێـی ئیسـتاندارەە خۆماڵییەکـان، تـاقی دەکـردەوە. هەر لە شـوبهاندنیان بە چـوارپێڕا بگـرە، هەتـا لاسـایی کـردنەوەی گوێـدرێژ. لەوانەیە لاسـایی کـردنەوەی گوێـدرێژ، بە بەراورد بە شـوبهاندن بە چـوارپێ، بە پێـوەری لایەنگرانـی مـافی ئـاژەڵانیش، کـارێکی زۆر زۆر نـاحەز نەبـێ. بەڵام ئەوەیـکە تـۆ کەسـێک مەجبـوور بـکەی بزەڕێنـێ و قەپـاڵ بە وێـنجە داگـرێ، لە پاشـان پێـی بفەرمـووی ئێسـتا تـۆ کەری، تەڵاقـت نەمـاوە و بـۆم هەیە خـوازبێنی لە کـۆنە خێزانـت بـکەم، بە پێـوەری کـوردەواری، دەچێـتە چوارچێـوەی ئەشـکەنجە هەرە سـەختەکان. دیـارە ئەوە تەنیـا بەشـێکی چکـۆلە لە پەیـڕەوی کـاری ڕۆژانەی خـاڵ عەبـاس بـوو. زینـدانییەکانیش کەمتـرین گرفتیـان، ئەو بەشـە بـوو و لە ترسـی لەشـکری کێچـی نێـو کـۆنە ئـاغەڵ، زۆریـش مەمنـوونی خـاڵ عەبـاس بـوون کە دەیهێشت بێنە دەرێ و لە نێو وێنجەدا بلەوەڕێن.

وەک سـەگ، سـەولە هەڵگـرتنەوە، وەک کەر زەڕانـدن و قەپـاڵ بە وێـنجە داگـرتن و شـەڕی دەسـتەویەخە دەگەڵ کێچـان، هیچییـان بەقەد ڕۆژووی بەزۆری، ئەویـش لەجـۆری چلەگـرتن، ورەی ئەو کـۆنە دەرەبەگانەیـان دانەبەزانـد. ئەو دەرەبەگـانەی تـاکو مـاوەیەک لەمەوبەر، لەسـەر زگـی خەڵـک ڕایـاندەبوارد و وەک شا دەژیان.

خـــاڵ عەبـــاس ئەوکـــات هێشـــتا نەببـــوو بە دەروێـــش، بەڵام لە ڕەســـمی چـــلەی چـــاک دەزانـــی و بەتەواوی وردەکارییەکـــانێوە، وەک پەیـــڕەوی زینـــدان، بـــردییە بـــواری جێبەجێکـــردنەوە. بەو جیـــاوازییە کە ئەوکـــات لەو لێـــڕەوارە خورمـــا دەســـتنەدەکەوت، و ئەو وەک جێگـــــــرەوەیەک مێوژەڕەشـــــــەی هەڵبـــــــژارد. بەڵام تەجـــروبە پێشـــانیداوە زگێـــک خـــووی بە گۆشـــت قەل گرتبـــێ، بەرگەی چـــلە کە هـــیچ، شەشـــەکانیش نـــاگرێ و لێـــرەدایە کە وەک چـــاوڕوان دەکـــرا، خاڵعەبـــاس تووشـــی یەکەم قەیرانـــی بەرپرسیارێتی خۆی بوو.

ئەو بەیـــانییە وەک ڕۆژەکـــانی دیـــکە، دەگەڵ تاریـــک و ڕوونـــی بەیـــانی، خـــاڵ عەبـــاس لە دەرکـــی ئـــاغەڵێ قـــوت بـــۆوە و بە دابـــی جاران، دەرکی ئاغەڵی وەبەر شەپاندا.

- وەرنە دەرێ سەگبابینە.

نەکەس هـــاتە دەرێ، نە هـــیچ دەنگێـــک هـــات و نە خـــاڵ عەبـــاس وێرای بچێتە ژوورێ.

- سەگباب خێوینە! ئێستا بۆ نایەنە دەرێ؟

بـــۆ مـــاوەیەک دەرکـــی ئـــاغەڵی وەبەر پێلاقـــان داوە، هەرچـــی جنێـــو لە هەنبـــانەی مێشـــکیدا هەبـــوو، بەوپەڕی خەســـتی، دەکـــاری کـــرد. تەنـــانەت ســـەردانیکەرانی ئەو بەیـــانییەی کـــانی پیـــاوان، دامـــاوی و لاواندنەوەکانیشـــی پشتڕاســـت دەکەنەوە، کە گۆیـــا وێـــڕای نەرمـــی

نواندنی، بەڵێنی تەواوکردنی چلەشی پێداون، کەچی هیچ سوودی نەبووە.

لەئەنجامدا، ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا کردی. برنۆ شەڕەی کە بۆخۆشی لە کارکردنی گومانی هەبوو، لە شانی داماڵی و یەکەم فیشەکی ژیانی شۆڕشگێڕی خۆی، بەرەو ئاسمان تەقاند.

دەنگی فیشەکی خاڵ عەباس، بەخێرایی ئاوەدانی بڕی و لە گەرمەی قاوەقاوی چوارپێ و زەڕڕی گوێدرێژ و هۆڕەی گاڕان کە خەریک بوو دەردەکرانە دەرێ، خۆی گەیاندە گوێی هەموو تاکی ئاوەدانی. هەربۆیە وەک ئەوەی لۆتی مەناف و ورچەکانی ئاوەدانییان بەسەر کردبێتەوە، بۆ دیتنی، تێکڕای خەڵک لە ماڵان وەدەرکەوتن و ڕوویان لە شوێنی بەزمی لۆتی مەناف کرد.

- ها کاک عەباس چ باسە؟ چ بووە؟

- ئەو سەگبابانە خۆیان لێ حەشار داوم، دەیانهەوێ چەکم کەن.

هەر ئەو مەزەندەیەی خاڵعەباسی بووە هۆی ئەوەی کە دەستبەجێ، کۆنگرەیەکی ڕاوێژکاری سەربەخۆ دابمەزرێ و هەڵسەنگاندن بۆ ئەگەرەکان بکا.

- وەڵڵا هەڵاتوون دەنا بۆ دەنگیان نایە.

- نەوەڵڵا ناوێرن بێنە دەرێ.

- ....

لە ئـاپۆڕەی تـرس و گومـان، کـۆنگرە بەردەوام بـوو هەتـاکوو تیشـکی ڕۆژ، بـاڵی بەسـەر ئـاوەدانی کێشـا و سـوراغێکی کـون و کەلێنـی زینـدانی خـاڵ عەباسیشـی کـرد. یەکەم کەس کە لەسـەر دەسـتی ئەو ڕوونـاکییە، سـەیری کـولانەی کـرد، چـوار کەلاکـی هـاتە بەر چـاو کە یەکـی مەیـدانێ خۆیـان ڕاکێشـاوە. ئیدی دەستبەجێ لێکدانەوەی یەکلاکەرەوەی خۆی ڕاگەیاند:

- بە مەرقەدی حەزرەتی غەوس، قەت تاقە یەکیان نەماوە.

لێکـدانەوەی ئەو پزیشـکە دادەی ئـاوەدانی، بـووە هـۆی ئەوەی خاڵعەبـاس، لە پشـتێن بەرەژێـری بمـرێ و هاوکـات کە بە دوو چەپۆکـان بە خۆیـدادەدا، هەوڵ بـدا بە هەمـوو توانـایەوە، دەوری پیاوێکی بێگوناحی زوڵم لێکراو، بگێڕێ.

- ئەی هـاوار! چـۆنم خـۆ مـاڵوێران کـرد! چـۆنم خـۆ بە ...دا. خـۆ بەخـودای کەسـوکاریان ئەتکـم دەکەن، دەمکـووژن. گـۆڕی بـابی ئەوەی ئەو چەکەی دا دەسـت ئەمـن. ئەمـن چـم بەو بەزمەی دابـوو. لە مـاڵە خـۆم بـێخەم دانیشـتبووم. لێـت نـاگەڕێن. بـابە ئەمـن چکـارەم؟ بـابم چەکـدار بـووە؟ بـاپیرم چەکـدار بـووە؟ بـۆ لـێم نـاگەڕێن؟ هـاتن لـێم وەژوور کەوتـن، حەتـمە هەر دەبـێ بێـیە گەڵمان، ئەتۆ نەبی هەر نابێ. بەسەری تۆ کەریان کردم... .

لە گەرمەی شـــین و ڕۆڕۆی خاڵعەباســـیدا، چەنـــد کەس بـــۆ پشتڕاســـتکردنەوەی بـــابەتەکە، چـــوونە نێـــو ئـــاغەڵەکە. هێشـــتا خاڵعەبـاس خەریکـی کـوتنەوەی دیـالۆگە پـڕ سـۆزەکانی بـوو کە یەکێک لە نێو ئاغەڵەکەڕا هاواری کرد:

- کـــاک عەبـــاس مـــزگێنیم دەیە چـــاک دەرچـــووی، مـــاون نەمردوون.

ئەو ئامـاژەیە بەس بـوو بـۆ ئەوەی خاڵعەبـاس دەسـتوبرد، بە بـێ تاســان، بــابەتی دەورگێــڕانەکەی لە پــاڕانەوە و لالآنەوە بگــۆڕێ بۆ خوێندنەوەی وتارێکی پڕجۆشی حیماسی، چینایەتی.

- لێیـان گەڕێـن لەو سـەگبابانە بـا پتـۆپن. وەرن لێیـان گەڕێـن. ئەوانە خوێنخـــۆرن، خـــوێنی هەژار دەمـــژن. هەردەبـــێ نەمێـــنن. مەرگ و نەمـــــان بـــــۆ زۆردارە. چینـــــی چەوســـــاوە هەر لە هەڵکشانە.....

خـاڵ عەبـاس خەریکـی وتـار خوێنـدنەوەی خـۆی بـوو کە کەلاک بە خێشــکە خێشــک ڕاکێشــرانە دەرێ. هاوکـات ڕوونـاکی خـۆر و هـــاتوچۆی جەمـــاوەر بـــۆ نێـــو ئـــاغەڵ، بـــووە هـــۆی ئەوەی کە گومـــانلێکراوانی ســـەرەکی، ئەو هەوڵ بـــۆ کوشـــتنە، بە شـــێوەی شـڵغە مـێش، هەوڵـی ڕاکـردن بـدەن. لە ئەنجـامی دەرپەڕینـی ئەو شـــڵغە مێشـــە، وەک ئەوەی لـــۆتی مەنـــاف ورچـــی لەدەســـت بەربـــووبێ، ئەنـــدامانی کـــۆنگرە ڕاوێژکـــارییەکە بەوپەڕی خێراییـــی،

بــۆ چــواربەری ســەرەکی ڕایــانکرد. بــۆ مــاوەیەک کەس کەلاکــی لەبیــر نەمــا و وەک شــێتان دەســتیان بە چــواردەوری خۆیانــدا دەوەشاند.

هەر کە شــڵغە مــێش بــڵاوەی کــرد، جەمــاوەر کەوتــنە ســوراغی کەلاکــان. کاتێــک کە بە دڵنیــاییێوە ڕوون بــۆوە کە ئەو کەلاکــانە ئەنجــامی پێــوەدانی لەڕادەبەدەری ئەو مێشــانەن، بە تەگبیــری بەســـاڵاچووان، کەلاک بـــۆ مـــاوەیەکی دیـــاری نەکـــراو دە قورِەســوور گیــران. ئەو کەلاک ســواغ کــردنە بــووە هــۆی ئەوەی کە ئــاوەدانی بــۆ یەکەم جــار لە مێــژووی خۆیــدا، ببێــتە خــاوەنی چــوار پەیــکەری ڕووتــی بە قــوڕ ســـواغکراو کە هەتــا کــاتی وەهـــۆش هاتنەوەیـــان لە دەرکـــی مزگەوتـــی ئـــاودانی، تەنیـــا شوێنێک کە ژنان بۆیان نەبوو سەردانی بکەن، درێژکرابوون.

کــاری قورِەســوور بــێ یــان هەر هــۆیەکی تــر، چــوار زینــدانی دامــاو، پــاش تاوێــک، هۆشــیان هــاتەوە بەرێ و پەردەیــان لەســەر نهێنییەکانی پاسەوانی خاڵ عەباس هەڵداوە.

گێڕایــانەوە کە چــۆن ئەشــکەنجەکانی خاڵعەبــاس، تــۆڵەی حەفتــا ســاڵ ئاغــایەتی لێکــردوونەوە. بەتــایبەت دابــی چــلە گــرتنەکەی کە بە پــێچەوانەی هەمــوو داب و نەریتــان مەجبــووری کــردوون پێــنج ڕۆژان بە مێــوژە ڕەشــە بەربانــگ بــکەنەوە، ئەوانــیش لەتــاو برسییەتی دەستیان بۆ ئەو شانە مێشهەنگوینە بردووە.

بە هــۆی هەوڵــی خاڵعەبــاس لەو مــاوەیەدا بــۆ ڕێگــری لە پێوەنــدی ئەو زینــدانیانە دەگەڵ خەڵــک و خــۆ شــاردنەوەی خەڵـک لەوان، هەمـوو ئەو گێـڕانەوانە بـۆ خەڵکـی ئـاوەدانی وەک چیرۆکێکـی سـرنجڕاکێش وابـوون و وەک ڕاسـتییەکی بـێ دژبەر ســەلمێندران. تەنیــا کەســێک کە لە بەرژەوەنــدی دابــوو وەدرۆیــان بخــاتەوە، خــاڵ عەبــاس بــوو کە لە کــاتی ورچ بەربــوونەکەوە کەس نەیــدیتبوو. حەوتــوویەکی پێچــوو هەتــا سەرلەنوێ ئاوەدانی بەسەرکاتەوە.

بۆخۆی دەیکوت:

- ئیشی تەشکیلاتیم هەبوو دەبا زوو ڕۆیشتبام!!

بەڵام پــاش ئەو چــوون و هــاتنەوە، نە ئەو پرســی کــوا زینــــدانییەکانم نە کەس بــــۆی گێــــڕاوە کە ئەو کــــۆنە دەرەبەگـانەی کە قەرار وابـوو وەک بـارمتە دەگەڵ چەنـد کەس ئاڵوگۆڕیــان پێبکــرێ، بــۆ دڵخۆشــی دانەوە، بێبەرامــبەر ئــازاد کراون.

ئەگەرچــی ئەو ڕووداوە بە جــارێ هەڤــاڵانی خــاڵ عەباســی لە بــابەت تواناکــانی، بــێ هیــوا کــرد، بەڵام ئەرکێکــی شکسـتخواردووی دیـکەی پێویسـت بـوو، تـا بەجـارێ کۆتـایی بە قۆنـاغێکی کـورتی ژیـانی خـاڵ عەبـاس بێنـێ و مـۆمی تەمەنـی شۆڕشگێڕی ئەو بکووژێنێتەوە.

- کــاک عەبــاس ســەردانێکی گونــدی... بــکە و داوا لە کەریــم ئاغای بکە هەتا ئێرە بێ.

واوێـــدەچێ خـــاڵ عەبـــاس ئەو داوایەی بە شـــێوەی خـــۆی تێگەیشـــتبێ، چـــونکە ئەوەی دواتـــر کـــردی، نەک تێگەیشـــتن، بەڵکـــوو لە بیســـتنیش نەدەچـــوو. بە پێـــی بیرەوەرییەکـــانی خـــۆی، ئەو ئەرکێکـــی گرینگـــی دراوەتـــێ، ئەویـــش لە کاتێکـــدا، بە تەنـــێ بـــۆ ئەو ئەرکە ڕاســـپێردراوە، کە ئامـــاژەیەکە بـــۆ گرینگـــی کەسایەتی وی.

- بــۆ کــاری ئــاوا, دەکەم کەســیان ڕادەدیــت. ئیــدی دەڵێــی ئەمنیــان پــێ هەو بــوو. بە ســەری تــۆ هەر بەو شــەوەی، بە پێیــان، بەو نێــو لێڕەوارەیــدا خــۆم گەیانــدێ. هێشــتا ڕۆژ ســیوادی نەدابــوو ئەگە خـــۆم دەنێـــو ئـــاوەدانی هاویشـــت. یەکســـەر لە پشـــتی کولانەی سەر سوانی بەرامبەر ماڵە ئاغای، سەنگەرم گرت.

ئەو بەشــە لە بەســەرهاتەکەی، لەو بەشــە کەمــانەیە کە زۆربەی شــایەدحاڵان گێڕانەوەکــانی پشتڕاســت دەکەنەوە و جیــاوازییەکی ئەوتۆیــان نیــیە. هەمــوو پشتڕاســتی دەکەنەوە کە چــۆن خــاڵ عەبـــاس ویســـتی، بەوپەڕی توانـــایەوە، بە برنـــۆ شـــڕەکەی، پاشماوەکانی نیزامی دەرەبەگایەتی سووک بکا.

- وەرە دەرێ گەواد. زوو خـــــــۆ بەدەســـــــــتەوە نەدەی ئەو خانووبەرەت بە سەردا دەڕووخێنم.

نەڕڕەی خاڵعەباسی، جموجوڵێکی لە ماڵە ئاغای سازکرد. کوڕی ئاغای بەدەم خەوەوە هاتە بەربیلایە و بەبێ ئەوەی بزانێ چ باسە، هەر کە چاوی بە خاڵعەباس کەوت، دەپێشدا ویستی جنێوەکەی بێولام نەهێڵێتەوە:

- ئەوە دەگەڵ کێتە دەویت باب؟

خاڵ عەباس کە وێدەچوو چاوەڕوانی ئەوەی نەبێ، لە کاتێکدا چەکی بەدەستە، کەسێک بتوانێ بەرامبەری بوەستێتەوە، خوێنی وەکوڵ هات و یەکسەر دەستی لەسەر پەلاپیتکە داگرت.

لە نێو خەڵکی دەیانکوت، خاڵ عەباس پێش ئەوەی فیشەکی باوێ، چاوی دەقووچێنێ، هەربۆیە کەریشی لە بن دەمی بۆ داکەی، نایهەنگێوێ. ئەوەش ڕووداوێکی ڕاست بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو ڕاستییە. هەموو خەڵکی ئاوەدانی گوێیان لە دەنگی فیشەک بوو، تەنانەت چەند کەسیان ئاگایان لە سەنگەر گرتن و سیڕەگرتنی خاڵ عەباسیش بوو. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ، کەس سوراغی ئەو فیشەکەی نەکرد کە وە کوێ کەوت و بۆ کوێ چوو.

فیشەک ئەوەی باشە ئەگەر هیچ کوێش نەهەنگێوێ، دیسانیش هەر بەسامە و کاری خۆی دەکا. لانیکەم لەو شوێنە بۆ خاڵ عەباس یاریدەدەر بوو و بەبێ ئەوەی هیچ

زەرەرێـک بـدا، کـوڕی کەریـم ئاغـای دەژووریَ کـردەوە و کەریـم ئاغای دەرپەڕاندە دەریَ.

- بەڵێ کاکە فەرمووا چ کارەی؟ چت دەویَ؟

- دەستوورم پێیە. دەبیَ بتبەم.

- دەستووری چی؟ بۆ کویَ؟

خـاڵ عەبـاس لەو جـۆرە کەسـانە بـوو کە لە ڕاویـَژی ئاساییشـدا قەتـــی بە پێویســـت نەدەزانـــی وڵامـــی زۆربەی پرســـیارەکان بـــداتەوە. وەک ئەوەی گـــوێی لـــیَ نەبـــووبیَ، ئەگەرچـــی بە دڵنیاییەوە هەمووی گویَ لێدەبوو.

- دەستوور دەستوورە، وەپێشم کەوە.

زەبـر و حیماسـەتی گفتـولفتی خـاڵ عەبـاس، زوو کەریـم ئاغـای بەو قەنـاعەتە گەیانـد کە وەدووکەوتنـی زیـادی بـیَ کەڵـکە و وا باشـــترە وەدووی کەویَ. بـــۆیە هەر لەوێـــڕا داوای کـــرد ئەسپەکەی بۆ زین بکەن.

- حەی حەی!! ئەسـپی چـی؟ پێمـوایە هێشـتا نەتزانیـوە چ باسـە. زیندانی و ئەسپ؟

- دەی کاکە ئەسپێکیش بۆ تۆ زین دەکەین.

- نابیَ. ئەمن سوار دەبم ئەتۆش وەپێشم کەوە.

دەروونناسـێکی زۆر شـارەزای پێویسـت بـوو تـاکوو ئەو ڕاسـتییە ئاشـکرا بکـا کە تەواوی بیـر و فکرەکـانی خـاڵ عەبـاس شـتێکی نەگـۆڕن. هەر فکرێـک هەوەڵ جـار بە مێشـکیدا هـات، دەبێـتە خـانەخوێ و لە ئاکامـدا تەرازووی لێکـدانەوەکانی بە جۆرێـک لاسـەنگ دەکـا کە هەمـوو مەنتقـی سـەلمێندراوی مرۆڤـایەتی لە ئاستی، سووک دەنوێنێ.

ئەگەرچـی خاڵعەبـاس لە ئەرکەکەیـدا تەواو سـەرکەوتوو بـوو و کەریـم ئاغـای بە بـێ زەحمەتێکـی زۆر لە ئـاوەدانی هێنـابووە دەرێ، بەڵام بەداخەوە خـاڵێکی زۆر گرینـگ کە خـاڵ عەبـاس ئەوکـات پێـی نەزانیبـوو یـا فکـری لێنەکردبـۆوە ئەوە بـوو کە کەریـم ئاغـا، ئاغـای گونـدێکی عێـراق بـوو نەک ئێـران. بە دڵنیـاییەوە خەبـاتی چینـایەتی خـاڵ عەباسـیش ئەودیـوی سـنووری نەدەگـرتەوە، بەو هـۆیەی کە لەودیـوی سـنوور، لەمێـژ بـوو خەباتی نەتەوەیی هەموو وڵاتی تەنیبوو.

خـاڵ عەبـاس لە کـاتی گەڕانەوەیـدا بـوو کە بەو باسـەی زانـی و بـۆی دەرکەوت کە داواکردنـی کەریـم ئاغـا تەنیـا بـۆ مەبەسـتی نـاوبژیوانی سـەبارەت بە پرسـێک بـووە. بەڵام ئەوکـات تـازە زانینـی بێکەڵـک بـوو، چـونکە هەر لەدوای بردنـی کەریـم ئاغـا، لەشـکرێک لە خـزم و کەسـی سـاز بـوون و کەوتـنە شـوێن پێـی. لەولاشـەوە هەڤـاڵانی کە بەو هەڵەیـان زانـی و بـۆنی لەشـکریان

کـرد، یەکسـەر خۆیـان لـێ بێـبەری کـرد و کەریـم ئاغایـان بەو قەناعەتە گەیاند کە مەبەستی خاڵ عەباس چەتەگەری بووە.

ئێسـتا ئەو لە عێـراق و ئێـران قاچـاغ و وەک جـوویەکەی لە هەردووک دینـان بـووە. چەنـد مانگێـک بەسـەر لوشـکە ئێسـترە چارەنووسسـازەکەیدا تێـپەر ببـوو و ئەو بە هەڵەیەک لە ڕۆژێکـدا لە شۆڕشـگێڕەوە ببـوو بە چەتە. وێـڕای هەبـوونی کۆشـێک منـداڵی سـەروپێچکە، غیرەتـی ئەوەی نەبـوو بچێـتەوە ئاوەدانی و ئاوای بە باش زانی بۆ ماوەیەک خۆ بشارێتەوە.

باپیرم بەڕەحمەت بێ هەمیشە دەیفەرموو:

- ڕۆڵە ئەگەر لە شـاری غەریـب مـایەوە، دوو جـێ بێمـنەتە و خەرجی ناوێ، مزگەوت بە ڕۆژ و خانەقا بە شەو.

دیـارە ئەوە تەجروبەیەکـی کـۆنە و خـاڵ عەباسـێش بەو نەقـڵەی زانیـوە، هەر بـۆیە دوای چەنـد ڕۆژ ڕوو دەکـاتە خانەقـایەک و لەوێ دەگیرسـێتەوە. بە پێـی گێـڕانەوەی خـۆی، دوابەدوای ئەو گیرسـانەوەی، خـۆ دەخـزێنێتە نێـو کـۆڕی دەروێشـان و تـۆبە دەکـا. لە مـاوەیەکی کورتـدا وا تـێکەڵاوی عیرفـان دەبـێ کە خەریـکە حەوت شـاری عیشـق دوودوو دەڕوا و کـۆڕی زیکـر دادەمەزرێنـێ. وای لێـدێ کە خەریـکە بەدەنگـی دیـزە و گـۆزەی چێشـتخانەی خانەقـاش جەزم دەبـێ. هەر لەو سـەروبەندەدایە کە یادگـارییەکی هەمیشـەیی لە لای چەپـی کەلەکەی، لەبـن

پەراسـووی، بـۆ خـۆی دیڵێـتەوە. برینێـک بە دریژایـی قولانجێـک کە لە کـــاتی جەزم بوونیـــدا خەنـــجەری پێـــدا هێنـــابوو. ئەو کاتەی بەوتەی خۆی:

- جەزمە چاکی نەگرتبووم.

کە منـداڵ بـووم لەو قسـەی خـاڵ عەبـاس تێنەدەگەیشـتم و بـۆم ببـــوو بە پرســـیارێکی گەورە. جەزم چیـــیە کەوا بە پـــێچەوانەی هەمـــوو شـــتێک, ئەگەر نەتگـــرێ تووشـــی ئـــازار دەبـــی؟ تەنیـــا جارێـــک کە هەوڵمـــدا بە زمـــانی منـــداڵانە لەدایکـــم بپرســـم، لە وڵاممدا کوتی:

- بڵێ خودایە ... خوارد، دەنا کوێر دەبی.

هەرئەوەی کە پێشـــنیاری کـــرد بە پیســـترین شـــتی ناســـراوی ئەوکـــاتی زەوی، خـــۆم لە یەکێـــک لە دوو دەردی هەرەگەورەی ئەودەمـــی یـــانی کـــوێری و گـــولی بپـــارێزم، تێگەیشـــتم کە خـــاڵ عەباس خەتایەتی.

ئەو بـــرینەی خـــاڵ عەبـــاس لێـــی بـــوو بە بەڵا و حەجمینـــی لـــێ هەڵگـــرت. تووشـــی ئـــازارێکی زۆری کـــرد و خســـتی. مـــاوەیەکی زۆر لەجێـــــدا کەوت و لە ئاکامـــــدا لەبەر ئەوەی کەس نەبـــــوو لەســـەر جێگـــا خزمەتـــی بکـــا، ترســـی وەلا نـــا. خانەقـــای جێهێشـــت و ڕووی دەماڵێ کردەوە.

شـــەوێکی ســـاردی پـــاییز، مـــاڵ و منـــداڵ بـــێخەم گەمـــارۆی کورســـیان داوە کە لەپـــڕڕا خەلـــیفەیەک بە مێزەرێکـــی کەســـکەوە، برنـــۆیەک دەشـــانیدا، وەک پەیـــکەری بـــودا، لـــوور بـــووە ژووری. هـــاتنە ژوور و کەوتنـــی یەک بـــوو و دوو حەوتـــووی پێچـــوو هەتـــا ڕووحی هاتەوە بەری.

بە درێژایـــی ئەو مـــاوەیەی کە لە مـــاڵی لەســـەر جێـــیە کەوتبـــوو، ترســـی ژانـــدرمان و برنـــۆ شـــڕەکەی قەراریـــان لـــێ بڕیبـــوو. بـــۆ ســـوکنایی خـــۆی و خێـــزانەکەی، وای تەگبیـــر کردبـــوو کە: ســـاڵ درەنـــگە، ســـاردی کـــردووە، مەگەر ڕاپـــۆرتی برنـــۆم لـــێەدەن، دەنـــا ژاندرمە ناگەڕێن، وا باشترە زوو چارەی برنۆکەی بکەم.

لە هەمـــوو ژیـــانی خـــاڵ عەباســـدا بـــاڵتۆی ئاڵمـــانی و برنـــۆی چێکۆســـلواکی لە جـــۆری پێـــنج تیـــرەکەی، دوو شـــتی خـــاوەن زۆرتـــرین گرینگـــی و کـــاریگەری بـــوون. خـــاڵ عەبـــاس هـــۆگرییەکی لەڕادە بەدەری پـــــــێ هەبـــــــوون، بەجۆرێـــــــک لە زۆربەی بیرەوەرییەکانیـــدا یـــا شـــوێن پێیـــان دیـــارە یـــا جێـــی خاڵیـــان هەســـت پێکـــراوە. بـــۆ ویـــنە لە کـــاتی گێـــڕانەوەی بیرەوەرییەکـــانی ژیـــانی شۆڕشـــگێڕی، هەر جێـــیەک باســـی ســـەرمای تێـــدابوو، ئیشـــتیای باڵتۆی ئاڵمانی دەکرد.

- کـــوڕە بـــابم ئەودەمـــی چ هەبـــوو. وەخـــت بـــوو ســـەرما بمانبـــا، شـــتێک نەبـــوو دەبەری کەیـــن. ئێســـتا شـــکور شـــت هینـــدە زۆرە.

ئەمـن ئەودەمـی ئەو بـاڵتۆیەم پێبـا چ مەنـزوورم بـوو؟ بە خـودای دەبەفرێدا دەنووستم.

ئەو کاتەش کە خەریک بوو قاچاغی دەکرد دەیکوت:

- ئێستا با برنۆیەکت پێبا و دەوڵەت وێرابای بێتە سەر ڕێت.

ئەو هـۆگرییەی بـۆ برنـۆکەی هەیبـوو، ببـوو بە لەمـپەڕ لەبەردەم فەوتانـدنی و دڵـی بـڕوای نەدەدا لە یەخەی خـۆی کـاتەوە، هەر بـۆیە ویسـتی بیشـارێتەوە. بـۆ ئەوەی دڵنیـا بـێ هیچـی لێنـایە، بە هەسـتیارێکی ئەنـدازیارانە، بە ڕۆنـی زەنـگ دەر و ژووری چەور کـرد. ئەوجـار پێسـتەیەکی تازەیـان هەبـوو جـوان بـۆی خـاوکردەوە و دە برنـۆکەی پێچـا. لەپاشـان، دەگەڵ مـاڵ نوسـتنان بـردی و لە باشـترین شـوینی نزیـک ئـاوەدانی، بە فکـری خـۆی، لە لاخرێـک دە ئەرزی خست.

بـۆ سـبحەینەکەی، تـازە لەسـەر نـانی کشـابۆوە و خەرێـک بـوو یەکەم جغـارەی تـووتنوپەڕی هەڵدەبەسـت کە سـێ چـوار منداڵی هاروهاج خۆیان بە ژووریێ داکرد:

- کـاک عەبـاس بـگەیە. تفەنگەکەتمـان دیـتەوە. لەو لاخـڕەیە. ئەو سەگانە خەریکن دەیخۆن.

بە بیستنی ئەو خەبەرە، خاڵ عەباس لە پشتێن بەرەژێر دەمرێ و وەک یەکەم کاردانەوە، نکۆڵی لە هەر جۆرە پێوەندییەک بەو چەکەوە دەکا.

- بڕۆن توخمەسەگینە. ئەمن تفەنگم لە کوێ بوو؟ بۆ ناچن بەدبەختم کەن، بەسەرمی دابڕن.

ئەگەرچی منداڵ بە هۆی کاردانەوە توندەکەی خاڵ عەباس بڵاوەیان کرد، بەڵام چەند خولەک دواتر دەرکی ماڵی خاڵ عەباس بوو بە شوێنی قەرەباڵغی ئاوەدانی. خەڵک بە تکا و هەڕەشە، خاڵ عەباس بە حاشا و سوێند و قورئان، کەوتنە بەربەرەکانی.

- کاک عەباس کاکە ئەو برنۆیەت لابەرە، دەوڵەت پێی بزانێ گۆنگەڵێکمان بۆ ساز دەبێ.

- برنۆی چی بابم. جا بۆ سەرم بە فەتەڕات نادەن. برنۆ بۆ ئی منە؟

- کاکە ئەتۆ نەبی کێ برنۆی هەیە. ئی تۆیە و دەبێ لایبەری.

ئەو هەروژم و زەختە وایکرد خاڵ عەباس بۆ دەربازبوونی پەنا بەرێتە بەر سوێندی یەکلاکەرەوە و بارودۆخەکە تووشی چەقبەستوویەکی درێژخایەن بکات.

- هەرسێک تەڵاقم کەوێ مافی منی پێوە نییە، ئیدی بۆ خەریکن بە زۆری زۆرداری بەسەر ئەمنی دادەبڕن.

تەڵاق خواردنی خاڵ عەباس هەمیشە خاڵی یەکلاکەرەوە بووە و مانای ئەوەی دەگەیاند کە پاش ئەو سوێندە هەر جۆرە لەسەر ڕۆیشتنێکی زیادی، کاردانەوەی خەراپی لێدەکەویتەوە.

بەوپێیە خەڵکی ئاوەدانی کە لە هەرجۆرە پێشکەوتنێک لەو دانوستاندنەدا بێ هیوا بوون، بڵاوەیان کرد و خۆیان بە ئەگەرەکان ئەسپارد. تاقانە یادگارییەکەی ژیانی شۆڕشگێڕی خاڵ عەباسیش کە بەهۆی بۆنی پێستەی تازەوە، ببووە جێی سرنجی چوارپێی ئاوەدانی و لە بن گڵ دەریانکێشابووە دەرێ، چەند ڕۆژێک وەک هەتیوی دەستی زڕدایک، بە هەناسەساردی، لە لاخر کەوت. لە ئاکامدا بەیانییەک برنۆ نەمابوو. خاڵعەباس کوتی خاوەنەکەی بردوویەتیەوە. خەڵک دەیانکوت لە ترسی تەڵاقەکەی بەدزی هەڵیگرتۆتەوە. ئیدی کەس لە ڕاستی ڕووداوەکەی نەزانی.

هەرچۆنێک بێ، برنۆی لەکۆڵ بۆوە و ویستی وەک یەکەم قۆناغی ڕزگاری سەیری بکا کەچی ڕۆژێک، ژاندرمە پێوەر بوون و لە ئاپۆڕەی شین و ڕۆڕۆی ژن و منداڵدا قۆڵبەستیان کرد و بردیان. بەو جۆرە نەیانهێشت قۆناغی دووهەمی ڕزگاری بە ساغی دەرباز بکا.

لەو ڕۆژەوە کەس هەواڵـی نەزانـی هەتـا سـێ سـاڵان، جـگە لەو تاقەجارەی بە چەرچییەکدا هەواڵی ناردبووە.

- بـۆم بە گەوەرێ بڵـێ, کچـێ مـاوم نەمـردووم. مەردی خـودای بـێ، نەچـێ بڵـێ مـردووە، مێـردی بکـاتەوە، ئەو منـداڵانەم لـێ هەڵـوەدا کـا. ئەوە دەمـبەن بـۆ سـەربازی. خـودا ڕاسـت بێنـێ ئیشاڵڵا زوو دێمەوە.

خـاڵ عەبـاس چەنـد وردە تـاوانی جۆراوجـۆری لەسـەر سـاغ بـۆوە و بەهـۆیەوە بە سـاڵێک زینـدان سـزا درا. ئەگەرچـی بە وتەی خـۆی، بێتـاوان گیرابـوو و ئەوە ئاغـا ئەو بەزمەیـان بۆسـازکردووە دەنـا دەوڵەت چـی بە وی داوە. لە پـاش تەواو بـوونی زینـدانەکەی چـونکە سـەربازی نەکردبـوو بەسـەری پیـری، دوو ساڵیشیان سەربازی پێکرد.

جێـی سەرسـوڕمانە هەمـوو ئەو لەپـڕڕا ونبوونـانە و ونکردنـانە لە نێـو بـێ هەڵوێسـتی خـزم و کەسـوکار ڕوویانـدەدا و هـیچ کەس نەبـوو لە مـان و نەمـانی بپرسـێتەوە و سـوراغێکی بگـرێ. خـاڵ عەباس وەک شارەزایەکی دەروونناسی لەو کاتانەدا دەیکوت:

- خـۆ ڕۆڵە ئەودەمـی ڕوحـم نەبـوو. ئێسـتا ئەو شـتانە پەیـدا بـوون. ئاغـا بە چـلەی زسـتانێ، لەسـەر کەڵەبـابێکی، نەمبـوو بیـدەمێ، بە مـاڵ و منـداڵەوە وەدەری نـام، کـاکم شـەوێکی وەخـۆ نەگرتم.

هەر ئەوەی کە کەس لەو مـــــاوەیەدا لە چارەنووســــی نەپرســــی، ئەو بەشــە لە ژیــانی بە شــاراوەیی هێشــتەوە بە تــایبەت ژیــانی نێـو زینـدان. بۆخۆشـی قەت مەیلـی لـێ نەبـوو باسـی بکـا، جـگە لەو کاتـانەی کە پێویسـت بـوو وەک بەڵـگە بـۆ گەڕانـی هەمـوو ئێــران، ئەو کەســانەی پــێ وەدرۆخــاتەوە کە بە دڵــی وی قســە ناکەن. ئەوکاتانەی لەلای ئێمە بە(ئەتۆ چووزانی) دەناسرانەوە.

تەنیـــا جارێـــک کە لە مـــاڵی ئـــێمە، بە ڕەچـــاوکردنی هەمـــوو پرۆتۆکۆلەکـانی تـایبەت بە دوانــدنی، بـاس لە ســەربازی خــاڵ عەبـــاس کـــرا، ئەو کـــاتە بـــوو کە خـــاڵ عەبـــاس بە بـــۆنەی هاتنەوەی کاکم لە سەربازی، بەسەریکردبووینەوە.

ئەو شــەوە خەریـک بـوو بە ئیشـتیا خوێنـدنەوەی بەراوردکـاری تــایبەت بە چــۆنیەتی ســەربازی ئێســتا و ڕابــردووی دەکــرد و تەواو قسەی خۆش کردبوون کە کاکم لێی پرسی:

- خاڵە لە کوێ سەرباز بووی؟

خـاڵ عەبـاس بە پـێچەوانەی خـووی تـایبەتی خـۆی کە وێـدەچوو پێـی قـاڕ بـێ جـوابی پرسـیاری دمڕووتـان بـداتەوە، بەهـۆی ئەوەی کە پرســـیارەکە لە خزمەتـــی خۆشـــکردنی باســـەکەدا بـــوو، بە لێوێکی بە بزەوە کوتی:

- ئەمـــن لە کـــن ئیســـفەهانێ ســـەرباز بـــووم. دوو ســـاڵی ڕەبەق لەوێ مامەوە.

بەو پێـــیەی کە هەموومـــان جـــگە لە خـــاڵ عەبـــاس لە بـــابەت پێوەنـــدی ئەو وشـــە بەو شـــوێنەی کە لە دنیـــای ڕاســـتیدا هەیە یەک وێنەمـــان لە مێشـــکدا هەبـــوو، گوێمـــان بـــو خوێنـــدنەوە بەراوردکـارییەکەی ڕاگـرت. بەڵام هەرچـی زیـاتر وردەکـاری بـۆ دەدرکانـدین زیـاتر گومانمـان لەسـەر ڕاسـتی گێڕانەوەکـان لەلا پەیـدا دەبـوو و ئاسـتی متمانەمـان بەو خوێنـدنەوە بەراوردکـارییە لاوازتر دەبوو.

- چۆن بوو نەدەهاتێوە؟

- ئیزنیـــان نەدەدایـــن، ماشـــێن نەبـــوو. دەبـــا بە پێیـــان دانێـــک ڕۆیشـتباین چووبـاینە سـەر ڕێگـای تـارانێ. حەفـتەی ماشـێنێک لە تـــارانێڕا دەهـــات، ئەویـــش یـــا نەمانـــدەزانی کەنگـــێ دەگـــاتێ یـــا جێگامان نەدەبوو.

- نا خاڵە دەچوو تارانێ.

- دەچووی چی ڕۆڵە، لەوێڕا دەهات. ئەتۆ چووزانی.

ئێرەمـان وەک هەڵەیەکـی نێـو وتـار لێکـداوە بەڵام هەڵەکـان هەر بەوەندە نەدەوەستان و ڕێچکەیان دەبەست.

- ئەدی بۆ خەرجی چت دەکرد؟

- هەمـــوو شـــتێکیان دەداینـــێ. بەڵام پیـــاو پـــووڵی هەر دەوێ. دەگەڵ عەجەمێکـی بـووینە بـرادەر، زۆر زرینـگ بـوو، کـوتی وەرە ئەگەر مەرەخەسیان داینێ دەچینە تارانێ کارێ دەکەین.

- جا دوور نەبوو؟

- کـوڕە نەوەڵـڵا دووری چـی. لێـی سـواری مینیبووسـی دەبـووین بە دوو ساعەتان دەگەیشتینێ.

ئەو بەشـــە لە گێـــڕانەوەکەی ســـێڕێیانێکی پـــڕ مەترســـی بـــوو. ئەگەر پێکەنیبـــاین تووشـــی شـــەڕی دایکـــم دەبـــووینەوە. ئەگەر گومانمـــان لە ڕاســـتی گێـــڕانەوەکەی کردبـــا هەتـــا بەدەردی گـــالیلەی نەبردبـــاین، دەســـتی لـــێ هەڵنەدەگـــرتین. ئەگەریـــش هیچمـــان نەکوتبـــا، دەبـــا وەک پیرێکـــی خەرفـــاو مەزەنـــدەمان بۆکردبـا، یـان ئەوەیـکە لە بەشـی خۆمـان دابڕیبـا و کوتبامـان بە شـــێتمان دەزانـــێ. بەڵام کـــاکم بە لەخـــۆبردوویی، لە ئاســـت زانست و مێژوو، هەستی بە بەرپرسیارێتی کرد و کوتی:

- جـا خـاڵە کـوا وایە. خـۆ بە فـڕۆکەش لە ئیسـفەهانێڕا بچـی بـۆ تـــارانێ، هەتـــا هەڵدەســـتێ و دەنیشـــێتەوە ســـاعەتێک زیـــاتری پێدەچێ.

بـــابم کە بە دڵنیـــاییەوە بە حەیـــاتی خـــۆی لە مەراغە بـــۆ ئەولاتـــر نەچووبـــوو، بـــۆ یەکەم جـــار متمـــانەی بە ســـەوادی ئـــێمە کـــرد و پشتی پێبەست.

- کــاک عەبــاس کوڕەکــان ڕاســت دەکەن، ئیســفەهان لە تــارانێ دووره.

چــاوەڕوان دەکــرا ئەو قســەی بــابم، کــاریگەری شــاراوەی لەســەر دەروونــی خــاڵ عەبــاس زۆر بــێ. هەربــۆیە وەک کــاردانەوەیەکی خێــرا، هاوکــات کە خەریــک بــوو کوڵەقەنــدی وەک شــوێنی شــارەکان لەســەر فەرشــەکە ڕیــز دەکــردن، بە شــێوەیەکی ئامــاڵ قەڵسی، کوتی:

- کــوڕە ڕۆڵە ئەتــۆ زۆر ســەیری! خــۆ نەچــووی، چــووزانی. ئەوە تارانە... ئەوە قەزوینە... ئەوەش ئیسفەهانە.

ئەمــن بەش بەحــاڵی خــۆم کــاتێ دیــتم ئیســفەهان چــۆتە باوەشــی قەزویــن، هەســتم کــرد خــاڵ عەبــاس خەریــکە بە هەمــوو تــاقەتی خـــۆی دە زانســـتی جوغرافیـــا دەڕێ. دەیـــهەوێ ئەویـــش بە دەردی گـــۆی زەوی بەرێ کە هەمـــوو عـــومری، حاشـــای لە ســـووڕانی کـــردووە و پەنـــجەرەی مـــاڵەکەی وەک بەڵـــگەیەک دانــاوە کە بیســەلمێنێ زەوی نــابزوێ دەنــا ئەو پەنــجەرەیە بــۆ هەر لەسەر جێی خۆیەتی.

دایکــم وەک شــارازایەکی کــارامەتر لە ئەخلاقــی خــاڵ عەبــاس، بــۆ ئەوەی بــارودۆخەکە تەشــەنە نەســتێنێ و کوڕەکــانی بەدەردی گالیلە نەچن، خۆی هاویشتە نێو باسەکە و کوتی:

- ئەریّ کـاکە دەڵـێن ئیسـفەهان زۆر خۆشـە، ئەودەمـیش هەروا خۆش بوو؟

- کچـیّ خۆشـی چـی! بە قـوڕێم گـرت! هەر دووسـەد مـاڵ دەبـوو نەدەبـوو. دەیـانکوت تـازەی بـوومەلەرزە لێهـاتووە دەنـا زۆرتـر بووە.

ئەو کـاتە هەرکەسـێکی دیـکەش لە جیـاتی ئێمەبـا، ئـارەزووی دەکـرد گـالیلە بـیّ و چیتـر ئەو بێشـەرمییە لە ئاسـت ڕاسـتی قەبـووڵ نەکـا، ئەگەرچـی پێویسـت بـیّ یاسـای نەنووسـراوەی گەورەوچـووکەش پێشـێل بکـا. هەر بـۆیە بە پشـتیوانی متمـانە بەخۆبوونی تازەلاوی هەڵمدایە:

-حەح! کـوڕە خـاڵە ئەوە دەڵێـی چـی! ئیسـفەهان چەندسـەد سـاڵە شارە، نیوەی تارانیّ دەبیّ.

پێمـوایە لەو کـاتەدا خـاڵ عەبـاس پەشـیمان ببـۆوە کە هەوەڵ جـار وڵامـی پرسـیاری دمڕووتـانی داوەتەوە و بـۆتە هـۆی ئەوەی کە ئێسـتا غیـرەت بـکەن ئـانگژای زانیارییەکـانی بـن، چـونکە بەبـیّ ئەوەی سـەری بـۆ لای مـن کە لەلای ڕاسـتی دانیشـتبووم، بسـووڕێنیّ، بە گۆشـەی چـاوی نیگـایەکی سـووککەری لێکـردم و فەرمووی:

- ڕۆڵە ئەمــــن ئەودەمــــی کە لە ئیســــفەهانێ دەرک بە دەرک لە کیــتەڵە ماســتی دەگەڕام، هێشــتا دایکــت لە بابــت مــارە نەکرابــوو. ئێستا ئەتۆ بەمن دەڵێی ئیسفەهان کوێیە!

خاڵعەبـــاس ئەوەنـــدە بە زەبروزەنـــگ قســـەی یەکـــلاکەرەوەی فەرمــوو کە بــۆ مــاوەیەک ئــێمەش دڕدونــگ بــوین کە لەوانەیە ئەو ڕاســت بــێ و ئــێمە بەهەڵەچــووبین. لە بــابەت ئامــادەبووانی تــر نــازانم، بەڵام ئەو باســە دوای ئەو شــەوە بــۆ مــاوەیەکی دریــژ بیــری منــی بە خــۆی ســەرقاڵ کــرد و لە هــۆیەکی ڕاســت بــۆ ئەو سەداســەد دڵنیــابوونەی خــاڵ عەبــاس دەگەڕام. نــاکرێ کەســێک، هەرچەنــد ناشــارەزا، دوو ســاڵ لە شــارێک بمێنێــتەوە و تەنــانەت ئاساییترین شتەکانی لە بیر چووبێتەوە.

بە فەرمـــوودەی پێشـــینیان، بەرخ هەمیشـــە لەبـــن ســـەوەتەیدا نــامێنێتەوە و ڕاســتی، ڕۆژێــک هەر قــوت دەبێــتەوە، ئەگەرچــی بە هەڵــکەوت. بــۆ مــن، ڕاســتی ئەو بــابەتە، ڕاســت لە شــوێنی جــێ نـــاکۆکی وەدەر کەوت، ئەو کـــاتەی وەک ڕێبـــوار بەرەو تـــاران دەڕۆیشـــتم. دوورونزیکـــی قەزوێـــن ببـــووم کە لەپـــڕڕا چـــاوم بە تـــابلۆیەکی قەراغ ڕێگـــا کەوت کە لەســـەری نوســـرابوو: دان ئیســـفەهان ســـی کیلـــۆمیتر. بـــۆ چەنـــد چـــرکەیەک وەک ئەوەی کە داریـــان لەســـەری دابـــم گێـــژ بـــووم و تەواوی وردەکارییەکـــانی ئەو شـــەوەم بە پـــێش چـــاو داهـــاتەوە. ئەوکـــاتە بەدڵەوە هەســـتم بە

قورسی مانای ئەو قسەی فارسان کرد کە دەڵێن: ( همە چیز را همگان دانند ).

خاڵ عەباسی بەستەزمان شارۆچکەیەکی چکۆلەی نزیک قەزوێنی بە نێوی دان ئیسفەهان، دەگەڵ ئیسفەهانی گەورە تێکەڵ کردبوو، دەنا هەموو زانیارییەکانی ڕاست بوون. ئەگەرچی هەردوو لا حەقمان بەدەست بوو بەڵام دەبێ شوکرانەبژێری خودای بین کە لە کاتی ژیانی بەو ڕاستییەی نەزانی کە بەڕێک حەق بە وی بووە، دەنا بە خاترجەمی دەیکرد بە بەیاننامەیەک و لە ملی سەگە بەڕەڵڵایەکی دەکرد بۆ ئەوەی هەموو کەلێن و قوژبنی شار لەو سەرکەوتنە ئاگادار بن لە پاشان وەک مامۆستایەکی لێزان و وەک پیرێکی دڵسۆز، بۆ ماوەیەکی نادیار، سەرقاڵی ئامۆژگاریمان دەبوو. خاڵ عەباس بەوجۆرە سەودای دەکرد.

بۆ کەسێکی ئاسایی، چاوەڕوان دەکرا سێ ساڵ ژیان لە بارودۆخێکی وەها نالەباردا، زۆر شتی فێر بکا، یەک لەوانە بەرپرسیارێتی لە ئاست بژێوی ماڵ و منداڵ. بەڵام لەبابەت خاڵ عەباسەوە هەر زوو مەعلووم بوو کە ئەو جۆرە چاوەڕوانییانە تەنیا مەزەندەن و گۆڕانی هەڵسوکەوتی وی، پێویستی بە هاندەرێکی بەهێزترە یا لانیکەم جیاوازتر. هاندەرێک کە خاڵ عەباس بەو قەناعەتە بگەیێنێ کە ناکرێ

هەتا سەر، دڵخۆش بە تاقە پەڵە زەوی بەربەرۆچکەی ئاسمان و سێ مانگا ڕەقان بێ و دەبێ ئێستا زیاتر هەوڵ بدا.

بەخۆشحاڵیەوە پاش ئەو هەمسوو چەرمەسەرییە، خودا ڕوحمی بە ماڵ و منداڵی کرد. حەوتوویەک نەبوو هاتبۆوە کە ڕووداوە نەخوازراوەکە، بوو بە هاندەرێکی زۆر بەهێزکە وەهۆش بێتەوە و هەوڵ بدا هێندێک لە هەژاری بسڵەمێتەوە. ئەو هاندەرەی کە خاڵ عەباسی لەو یاری خۆماڵییە کرد کە هەمیشە تێیدا باڵادەست بوو. ئەو هاندەرەی خاڵ عەباس، جیاواز لە هەموو هاندەرێک، تەنیا هاندەر نەبوو، بەڵکوو بۆی بوو بە خاڵێک کە پێناسەی بەشێکی گرینگ لە ژیانی دەکرد و تا ئەو ساتە وەک بیرەوەرییەکی نەخوازراو لە مێشکی جەماوەردا ماوەتەوە.

خاڵ عەباس هەمیشە وەک یاریکەرێکی هۆگری یارییە خۆماڵییەکان دەناسرا، بە تایبەت دامە. هۆگرییەکەی تا ئەو ڕادەیە بوو کە هەمیشە لۆچێک سەرە پیپسی بۆ دامە، دەگیرفانی پانتۆڵەکەیدا ئەودیواودیویان دەکرد و بەقەت دەنگی زەنگوڵەی نێری، ئاگادارکەرەوە بوون. (غەنیم)ی سەرەکیشی ئەوەندەی جیرانی ئێمە بوون، هەر بابم بوو. بابیشم لە باری هۆگریوە لە خاڵ عەباسی دانەدەما بەو جیاوازییەی کە بابم نۆڕیسکێنیشی دەکرد. تەختە فیبرێکی هەبوو کە لە سیپە چای کردبۆوە. دیووی ژوورێی کە لووستر

بــوو بــۆ دامەی تەرخــان کردبــوو، دیــوی دەرەوەی کە نوســراوەی لەسەر بوو بۆ نۆڕیسکێن. لەبابەت هۆکارەکەشی دەیکوت:

- دیــوی دەرێــی نوســراوەی لەســەرە،کاک عەبــاس چــاوی چــاکی نابینێ.

لە کــاتی دامە کردنــدا هەر کامەیــان جۆرێــک لێــی ڕادەمــا. خــاڵ عەبــاس پشــتی لە دیــوار دەکــردەوە، لاقێکــی بــۆ بــن خــۆی خڕدەکــردەوە ئەوی دیــکەی دەچەقانــد. دەســتی بە جغــارەی داویشــتە ســەر چــۆکی. جارجــار مژێکــی لە جغــارەکەی دەدا و لەبەر دووکەڵەکەی کە ئامبــــازی چــــاوی دەبــــوو، لاچــــاوێکی دەقووچانــد. دەســتەکەی دیــکەی کە بــۆ بزاوتنــی داشــەکان تەرخــان کرابــوو لە کــاتی چــاوەڕوانی نــۆرەدا کــونی لــووتی پێدەپشــکنی. بــابم فیگــۆڕەکەی جیــاواز بــوو. بــۆ لایەک خــوار دەبــۆوە و دەســتێکی دەچەقانــد. دەســتەکەی دیــکەی ئەگە لە جوڵانــدنی داشــان دەبــۆوە، دەیبــردە بــن پــێچوکڵاوەکەی و نەرم نەرم سەری دەخوراند.

ئەگەرچــی ئەوەنــدەی بەبیــری مــنە خــاڵ عەبــاس هەر دامەکەر بــووە بەڵام بەوجــۆرەی دەگێــڕنەوە، یــاری ســەرەکی خــاڵ عەبــاس لە پێشــدا مێشــێن بــووە و مێشــێن لە دڵــی ویــدا پێگەیەکــی تــایبەتی هەبــووە. بــۆ سەلماندنیشــی دەکــرێ بکــوترێ، هەر ئەوەی کە خــاڵ عەبــاس دوای ســێ ســاڵ دووره وڵاتــی و گەڕانەوەی

پڕشکۆی لە ئاپۆڕەی سەردانیکەراندا، بە پیری سەری، ملی لە مێشێن ناوەتەوە، بۆخۆی بەڵگەیە بۆ بایەخی ئەو کایە ڕەسەنە، لە دڵی خاڵ عەباسدا. هەڵبەت تا ئەو کاتەی بۆتە بازەرگان.

بەدرێژایی مێژووی هاوچەرخی ئاوەدانی، جگە لەو چەند ساڵەی دواییدا، بەحوکمی ئەوەی کە دەرکی ماڵی خاڵ عەباس تەنیا شوێنی گۆڕی ئاوەدانی بوو و دەکرا مێشێنی لێبکرێ، سێ شت گرێدراوی یەک بوون: خاڵ عەباس، دەرکی ماڵی خاڵ عەباس و مێشێن.

هەموو پاییزان دەگەڵ تفاق خڕدەکراوە و سەری گیشان دەگیرا، مێشێن دەستی پێدەکرد. بەبێ ڕەچاوکردنی تەمەن هەرکەس کەللایەکی پێبا بۆی هەبوو بچێتە دەنۆرەی. ئەوەی زۆری دەخۆیڕا دیتبا بە دوو کەللا بەشداری دەکرد. هەموو ڕۆژێ پاش بانگی ئێواری، جەماوەر کەللا بەدەست و قەرەپوول لە گیرفاندا، بەرەو دەرکی ماڵی خاڵ عەباس ڕێچکەیان دەبەست. بەڵام کێ پێشبینی ئەوەی دەکرد ئاوا بە ڕۆژێک سێسوچکەی مێژووی ئاوەدانی بەجارێک لەیەک ترازا بن و خاڵ عەباس ببێتە لەمپەرێک لەسەر ڕێی گەشەکردنی یارییە خۆماڵییەکان.

دیارە ئەو ڕۆژە چارەنووسسازە کە تێیدا وەرچەرخانێک لە ژیانی خاڵ عەباس و ڕەوتی گەشەی یارییە خۆماڵییەکان

ڕوویـــدا، لە ســـەرەتادا ڕۆژێکـــی ئاســـایی بـــوو. بەڵام لە ڕاســـتیدا هەمـــوو کارەســـاتێک هەر لە ڕۆژێکـــی ئاســـاییدا دەقەومـــێ ودواتـــر دەبێ بە ڕۆژێکی جیاواز.

ئەو ڕۆژە تـــایبەتە، خـــاڵ عەبـــاس بەپێـــی ڕەســـمی ڕۆژانـــی قەدیـــم، ئەگەرچـــی مانـــدوویەتی چەنـــد ســـاڵ دووری هەر پێوەبـــوو، ئەرکـــی میوانـــدارییەتی یاریگـــای بەجـــێ هێنـــابوو و جـــگە لە خـــاوێنکردنەوە، ئاوپرژێنێکی چاکیشی کردبوو.

هەر لە زووووە، خـــاڵ عەبـــاس هەســـتی بە خاوەنـــدارییەتی یاریگـــا دەکـــرد. قســـەی دەڕۆیـــی و هەمیشـــە بۆخـــۆی مەڵـــڵا بـــوو. پاشـــمەڵڵا و نۆرەکـــانی تـــریش بە پێـــی کـــاتی ئامـــادەبوونی یـــاریکەران دیـــاری دەکران.

ئەگەرچـــی ئەوە یەکەم یـــاری وەرزی خـــاڵ عەبـــاس، پـــاش چەنـــد ســـاڵ دابـــڕان بـــوو، بەڵام بە پێـــی ئەو فشـــارەی خســـتییە ســـەر خـــۆی، دەکـــرێ ڕادەی گرینگـــی ئەو یـــارییە هەســـت پێـــبکەین. لەوانەشە وەک سەرچاوەیەکی بژێوی کاتی سەیری کردبێ.

مێشـــێنکەران هەمـــوو بەڕیـــز وەســـتاون و چـــاوەڕێی نـــۆرەی خۆیـــانن. قەرەپـــــووڵ بەڕیزداکـــــراون و چـــــاوەڕێی وێکەوتنـــــی کەللاکـــــان دەکەن. خـــــاڵ عەبـــــاس هەڵتروشـــــکاوە و وەک مەڵڵایەکـــــی متمـــــــانەبەخۆ، ویســـــــتی بە یەکەم هاویشـــــــتنی یـــــــادی ســـــەرکەوتنەکانی ڕابـــــردووی بکـــــاتەوە. بەڵام یەکەم تـــــاقەتی

تـێکەڵ بە دەنگێکـی نـامۆ بـوو و ئامـادەبوانی خسـتە دڕدونگێکـی تـاقەت پـڕوکێن. زۆر بە ئاسـپایی و بە نەرمـی سـەرێکی هەڵهێنـا، وەک ئەوەی بـــێهەوێ هەڵوێســـتی بیســـەران بزانـــێ. لەدرێـــژەدا بەبـێ ئەوەی خـۆ بشـڵەژێنێ چـاوی خسـتەوە سـەر کەلـلاکەی و هاویشـــتی. خۆویســـت بـــێ یـــا لە شـــەرمان، کەلـــلا مەیلـــی لە قەرەپـــوولان نەبـــوو و لاڕێ ڕۆیـــی. ئەو لاڕێ ڕۆیشـــتنەی، وەک هەلێـــک قـــۆزتەوە و خـــۆی گەیانـــدە کەلـــلاکەی. پڕپیێـــداگرت و ئەوەندی تاقەتی هەبوو، گرتی، بە دیواری دادا.

- گـــۆڕی بـــابی خێـــوت... بـــۆ کەلـــلات، کەس نـــازانێ بە کوێـــدا دەڕوا. ئەو ئەرزە بـــۆ هەمـــوو بـــۆتە قـــوڕ؟ ئەو پـــوولەت بـــۆ ئـــاوا خـــوار داکـــردووە؟ ئەتـــۆ بـــۆ دوو کەلـــلات پێـــیە؟ بەتـــۆم نەکـــوت مەیەوە دەرکـی مـن مێشـێنێ مەکە. ئەنگـۆ بـۆ لێـرەن بـۆ نـاچنەوە مـالاتی تـاقەت کەن؟ خـۆ دەرکـی مـن قاوەخـانە نیـیە هەمـوو ڕۆژێ لێرە قوت دەبنەوە، هەستن بڵاوەی کەن... .

زۆر شـــت هەن کە هەســـت پێکردنـــی کاریگەرییـــان، تەنیـــا بە ڕەچـاوگرتنی کـات و شـوێنی قەومانیـان دەکـرێ. بـۆ ئەو کـاتی هەڵەیەکـی ئـاوا، هەرچەنـد نەخـوازراو، لـێکەوتەی زۆر قورسـی هەبـــوو. لانـــیکەمەکەی ئەوە بـــوو کە بـــۆ هەڵەکـــار دەبـــوو بە ســـەرەتای مێـــژوو و هەمـــوو ڕووداوەکـــانی ژیانیـــان بە بەراورد بە کـــاتی ئەو هەڵەیە دیـــاری دەکـــرد. وەک چـــۆن بـــابم دەیکـــوت

کاک عەباس لە پاش ترەکەیرا بە شاری زانی و فێری کاسبی بوو.

ئەم هەڵەیە تایبەت بە خاڵ عەباس نییە و لە ژیانی هەموو کەسێکدا لەوجۆرە ڕووداوانە هەن کە وەک خاڵێکی هەمیشە بەرچاو، بە درێژایی ژیانی خۆدەنوێنن و مێژووی ژیانی پێناسە دەکەن. بەڵام ناکرێ باسی ژیانی خاڵ عەباس بکەی و خۆ لە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانە بپارێزی. بۆ خاڵ عەباس، گێڕانەوەی ژیانی شۆڕشگێڕی بەبێ وەبیرهێنانەوەی زیندانەکەی، ژیانی دەروێشی بەبێ وەبیرهێنانەوەی جەزم بوونەکەی و دەسپێکی ژیانی نوێی وەک بازەرگان، بەبێ وەبیرهێنانەوەی ئەو ڕۆژە نامبارەکەی ناکرێ. هەرچەندە لە ئاکامدا ئەو ڕووداوە ناخۆشە بۆی بوو بە هاندەرێک تاوەکوو چیتر گیرۆدەی مێشێن نەبێ و خەمی بژێوی خۆی و ماڵ و منداڵی بخوا.

ئەو لەپڕڕا دابڕانەی لە مێشێن چەخماخەی بیرۆکەیەکی نوێی لە مێشکی خاڵ عەباسدا لێدا و هەوڵیدا تواناکانی خۆی لە بواری بازەرگانی تاقیکاتەوە.

یەکێک لە تایبەتمەندییە هەرە ناوازەکانی خاڵ عەباس، گەشبینی لە ڕادەبەدەری بە سەرکەوتنەکانی خۆی بوو. تەنیا کەسێک کە دەتوانایدا هەبوو، لۆرییەک کولەکەی شەققەباغی، بەرێتە ئاوەدانییەکی چلپەنجا ماڵی و بە فرۆشتنی تەواوی

هەر لەو دێیە گەشبین بێ، خاڵ عەباس بوو. دەکرێ بکوترێ هەر ئەو گەشبینییە بوو کە وای لێکردبوو بە پێویست نەزانێ خۆ بە وردەکارییەکان و ئەنجامی کارەکانی، ماندوو کات. هەرکە دەیویست کارێک بکا، بەبێ هیچ نەخشەڕێگایەک، دەیبردە بواری جێبەجێکردنەوە. بە شەوێ پیلانی دارشت ببێتە بازەرگانی پێخۆر، بەیانی کەرەکەی جلوبەر کرد.

هەموو ئامرازی پێویستی بازرگانی پێخۆری خاڵ عەباس، توربێنێک و کەرێک بوون. دەسمایەکەشی قەرزی هەتا ئێوارێ بوو. ماست و پەنیر و رۆنی ئاوەدانی بە قەرزی هەتا ئێوارێ وەردەگرت و دەگەڵ ڕۆژ سیوادی دەدا بە سواری پیرەکەر بەرەو شار جاڵەدەبۆوە.

ئەو پیرەکەرەی خاڵعەباس، خاوەن چیرۆکێکی تایبەت بوو و لە باری وەفاداری و ئەمەگناسی، لە ڕەخشی ڕۆستەم دانەدەما. چەندین ساڵ بوو، بەسەری پیری، بە بەندو سەرماش، بۆی نەبوو ڕەنگی تەویلەی ببینێ و دەگەڵ دەسپێکی بەفروسەرما، بەرەڵڵا دەکرا. مەبەست ئەوە بوو گورگ بیخوا، چونکە تفاق نەبوو بیدەنێ. بەڵام پیرەکەر زۆر خۆڕاگر بوو. هەموو ساڵێ، وەک ئەوەی هەست بە قەیرانی خۆراک لە ماڵی خاڵ عەباس بکا، دەگەڵ سەرما دەهات، غەیب دەبوو و کەس سۆراغی نەدەکرد. بەوەی دڵخۆش بوون گورگ دەیخوا و لە یەخەیان دەبێتەوە، کەچی وەک ئەوەی

بە حەوت کەســـــان ڕایکێشـــــن، هەرکە ئەرز ڕەش دەبـــــۆوە، لەدەرکی ماڵی خاڵ عەباس قوت دەبۆوە.

ئەو ســاڵەش پیــرەکەر خەریــک بــوو ملــی ڕێــیە بگــرێ و بــڕوا، کەچــی بە ئەوپەڕی سەرســوڕمانەوە ســەیری کــرد خــاڵ عەبــاس خەریــکە بــۆ نێــو تەویــلەی خــولقی دەکــا. بە چاوپۆشــی لە ئامــانجی ئەو خولــق کــردنە و ئەوەیــکە پــێچەوانەی سروشــتی شــەرتی بــووی ئەو ئــاژەڵە بــوو، دەکــرێ بکــوترێ ســەودایەکی دووســەر براوە بوو.

بە یــارمەتی پیــرەکەر، خــاڵ عەبــاس چەنــد وەرزی بەوجــۆرە تێپەڕکــرد. وردەوردە کەچە تێگێشــتنێکی لە هەڵســوکەوتی بــازاڕ پەیــدا کــرد و خەریــک بــوو وەک چەرچــی بە دێیانیشــدا دەگەڕا. ئەگەرچـــی لە بــاری داهــاتەوە خەریــک بــوو دەبــووژاوە، بەڵام سروشـــتی تـــایبەتی خـــۆی وەک هەمیشـــە ڕێگـــر بـــوو لە گەشەســـەندنی زیـــاتر. پـــارچەکرداری لەناکـــاوی هەمیشـــە لە ئاکامدا توشی گرفتیان دەکرد.

وەک هەمــوو شــتی تــر، بازەرگــانی خــاڵ عەباســیش، ســەرەتایەک و کۆتـــاییەکی هەبـــوو، بە ترێـــک دەســـتی پێکـــرد و هێشـــوو ترێیەک، بووە هۆی کۆتایی پێهاتنی.

خــاڵ عەبــاس بە حــوکمی ئەوەیــکە فێــری بــازاڕ ببــوو و دۆســت و ئاشـــنای پەیـــدا کردبـــوو، بە متمـــانە بەخۆبـــوونێکی زۆرتـــر

هەڵسوکەوتی دەکرد. وردە سەودای دەکردن و شوێن و شتی تازەی تاقی دەکردەوە. هەمیشە هەروایە، کەسێک کە خوو بە شوێنێک یا کەسانێک دەگرێ، پاش ماوەیەک متمانەی بە خۆی زیاتر دەبێ و جیاوازییەکانی لەبیر دەچێتەوە، بەتایبەت ئەو جیاوازییانەی سەرچاوەکەیان مێشکی نەخۆشن.

کابرا مەجوحمەیەک تریێ سپی بە ئیشتیا هەڵچنیوە بە جۆرێک کە دەڵێی تەمای نییە بیفرۆشێ و بۆ جوانی دایناوە. خالۘ عەباس لێی خورڕ دەبێتەوە. دەست بۆ هێشوویەک دەبا بۆ ئەوەی دەنکێک لێکاتەوە و تامی بکا کە بەهۆیەوە هێشوویەک بەردەبێتەوە.

- کاکە ئەوە کیلۆی بە چەندییە؟

کابرای ترێی، وەک ئەوەی هۆکاری کەلێنی قووڵی نێوانی ترۆپۆز و گیرفانی دیتبێتەوە، لەپڕڕا گڕی گرت و نەڕاندی:

- بۆ وا دەکەی بابم بۆ وا دەکەی؟ بۆ پڕدەدەیە شتەکەی؟ تێی ڕیای. هەمووت خەراکرد.

خالۘ عەباس بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ، هێشووکەی لە جێی خۆی داناوە و ڕووی وەرگێڕا کە بڕوا.

- کەڕڕە کرمانجی سەگباب ئەوە بۆ خواردنی تۆیە!

بە دڵنیاییەوە ئەگەر کابرا زانیبای بیستنی ئەو وشانە، مۆڵەتی چ کاردانەوەیەک دەدا بە خاڵ عەباسی، قەت ئەو قسەیەی لە چۆلگەش نەدەکرد.

خاڵ عەباس کە بەوتەی خۆی، هەڵبەت بە وشەی تایبەتی خۆی، بە واتایەک پەرۆشی یەکسانی کۆمەڵایەتی بووە، ئەو سووکایەتی پێکردنەی زۆر لە دڵ گران هات، هەربۆیەش بەردەبێتە سەروگوێلاکی ئەو لایەنگرەی چینایەتی. تا ئەو جێیەی بۆیکراوە بە هەموو تواناوە دەنگی دوژمنی یەکسانی، کپ کردووە و لەو ڕێگایەدا تاکە ئامرازی بەردەستی، یانی گۆچانەکەی، بەجۆرێک تێیدا وردوخاش کردووە کە بە شایەدی شایەدحاڵان، لە ئاکامدا بۆ دەسکەچەقۆش نەدەبوو.

واوێدەچێ خاڵعەباس بەو کاردانەوەی ڕقی چەند ساڵ بەدبەختی خۆی بە کابرای ڕشتبێ، بۆیە نیگەرانی ئاکامەکەی نەبووە.

- ئەمن کاری خۆم کرد، جا چ دەبوو با ببێ!

پاسەبان پێوەربوون خاڵ عەباسیان بە تێهەڵدان ڕاپێچی شەهربانی کرد و کابرایان بە کەلاک بۆ نەخۆشخانە گوازتەوە.

- هەر لە بانگی نیوەڕۆیەڕا هەتا بانگی ئێوارێ کوتایانم.

تەنیـــا خـــاڵ عەبـــاس دەتـــوانێ کوتانیشـــی بە شـــێوەی حیماســـی بگێڕێتەوە و بە وەبیرهێنانەوەی ئەو ڕۆژە بزە بێتە سەر لێوی.

- لای ئێـواری کابرایـان بەسـەروگوێ پێچـراوی هێنـا بەرامـبەرم دایاننا. کوتیان دەبێ ڕەزایەتی لێوەرگری دەنا دەچییە زیندانێ.

لەو بەشـەی گێڕانەوەکەیـدا ڕەنگـی پیـاوی مەسـڵەتانی دەگـرت و دەنگە زەلامەکەی نەوی دەکرد.

- کـوتم کـاکە ڕەزایەتـی چـی؟ ئەوە جنێـوی بە مـن داوە ئەمـیش تێروپـــڕم تێهەڵـــداوە. ئێـــوەش هـــاتوون ئەمنتـــان گرتـــووە، دوو ســـــاعەتە دەمکـــــوتن، جنێـــــوم پێـــــدەدەن، کوتـــــانەکەم بە کوتانەکەتان، جنێوەکانیش زیادی، ئیدی چیتان لێم دەوێ؟

هاوکـــات کە بە دەم و لێـــوی لاســـایی شـــێوەی قســـەکردنی بەرپرسـی شـەهربانی دەکـردەوە بە ڕسـتەیەکی بەدەنـگ کـوردی و بە ناوەرۆک فارسی، قسەکانی بەرپرسەکەی دەکوتەوە.

- چاولێکە غوربەتی یا ڕەزایەت میگیری یا میری زیندان.

بـۆ کەسـێک کە خـاڵ عەباسـی ناسـیبا، لەو کاتـانەدا تەنیـا شـتێک کە چـــاوەڕوانی نەدەکـــرد، پاشەکشـــە کردنـــی بـــوو. هەڵـــبەت پاشەکشەی ئیستراتێژیک جیاوازە.

- کـوتم نایـدەم دەچـمە زینـدانێ. یەک لەوێ دەینووسـی، هـاتە بـن گـوێم کـوتی: ئەتـۆ سـابقەت خەراپە، بچیـیە زینـدانێ تـازە

نـایەدەرێ. دووسـەد تمەنـی بـدەیە، ڕەزایەتیـت بـۆ وەردەگـرم. تمەنـێکم شـک نەدەبـرد. حـاجییەک لە بـازاڕی، دەیناسـیم، بە قەرز بۆی دام.

لە کۆتاییـدا، هـیچ شـوێنەوارێک لەو حیماسـەتەی سـەرەتاکەی نەدەمـا و گێـڕانەوەکەی تـێکەڵاوی سـەرلەقاندنێکی بێهەسـت دەبـوو بە جۆرێـک گـوێگری لەبـارەی ئاکـامی ڕاسـتەقینەی چیرۆکەکە، دەخستە گومانەوە.

لە شـەهربانی کە هـاتە دەرێ، تـازە بە دەردی خـۆی زانـی. سـەروبنی شـاری پشـکنی، بەڵام نە پیـرەکەری دیـتەوە نە تـوربێنەکەی. بەیـانی کە هـاتە شـاری، خـاوەنی گوێـدرێژێک و بارێـک پێخـۆر بـوو، بەڵام ئێسـتا نەتەنیـا گوێـدرێژی نەمـاوە، بەڵکـو دووسـەد تمەنـیش قەرزدارە. لەو بـارودۆخەدا ئەگەر توانیبـای بگەڕێـتەوە دواوە، پێمـوایە بۆخۆشـی بـژاردەی زینـدانی، بۆ بژێوی ماڵ و منداڵی، بە باشتر دەزانی.

– ئەودەمـی زۆر بـوو بـابم. بە دە کەیخودایـان پەنجـا تمەنیـان دە گیرفاندا نەبوو.

لە ئاکامـدا بە نائومێـدی بە پێیـان ملـی ڕێگـای گـرت و گەڕاوە ئـاوەدانی. ئەوشـەوەی بە شـەڕی دەسـتەویەخە دەگەڵ فکـری مـایەپووچبوون ڕۆژ کـردەوە و بڕیاریـدا تەرکـی بازەرگـانی بکـا. بەیـانی هەرکە دەرکـی حەوشـەی کـردەوە سـروە هـات و بـۆنی

پیـــرەکەرکەی بــۆ هێنــا کە هــاتبۆوە و بەرامــبەری حەوشـــەکەیان چەقیبوو.

خاڵعەباس بە دیتنی پیرەکەر، کەوتە دووڕیانێکی سەخت.

- کـوتم: ئێسـتا چـت لێـبکەم نە تـازە دەچـمەوە شـاری پێخـۆرت لێ بارکەم، نە بۆ فرۆشتنێش دەبێ.

بـۆ ڕێزگـرتن لە مانـدووبوونەکانی، خـاڵ عەبـاس بەڵێنیـدا زسـتانێ دایکــاتە ژوورێ. بەڵام ئێســتا زوویە. بەفــر نەکەوتــووە. لە دەرێ تێر دەخوا. با چەلێ لەدەرێ بێ.

پیـــــرەکەر چەنـــــد ڕۆژێـــــک لەدەوری ئـــــاوەدانی ســـــووڕاوە و چـاوەڕوانی خـولقی خـاڵ عەبـاس بـوو. کە دیتـی هـیچ بـاس نیـیە، ڕۆیی.

- ئەگەر خـــودا مەیلـــی لـــێ بـــێ، دڕوو زەردکەت بـــۆ دەکـــا بە ســـەرین. بـێخەبەر لە ژوورێ دانیشــتبووم، مـام ســەعیدی ئـالانێ لـــێم وەژوور کەوت. کــوتی: چـــم لێـــدەکەی؟ کەرەکەم لە ســـەر ڕێـیە تۆپیـوە. کـۆڵێکم گـوێز و مێـوژ پێـیە بیـبەم بۆشـاری. دەڵـێن کەرێکت هەیە دەیفرۆشی.

خـــاڵ عەبـــاس کە یەکێـــک لە گەورەتـــرین هەلەکـــانی مێـــژووی ژیانی بۆ ڕەخسا بوو، کوتی:

- کەرەکەم دەگەڵ گـــاڕانی دێـــیە. هەتـــا چـــایەک دەخـــۆیەوە و سەرخەوێک دەشکێنی دەچم دەیهێنمەوە.

لە خۆشـــی ئەو هەلە زێـــڕینەی، خـــاڵ عەبـــاس وەک فیشـــەک دەرپەڕی و بـــۆ دیتـــنەوەی پیـــرەکەرەکەی، هەر باســـکەی بە شـــەقاوێک دەبـــڕی. دەبـــێ لەو کـــاتەدا زۆر پەشـــیمان بـــێ کە هیـــوای بـــۆ قەپـــاڵی گـــورگ خواســـتبێ. لە ئاکـــامی هەوڵ و مانـــدووبوونێکی زۆر، پـــاش چەنـــد ســـاعەت گەڕان، پیـــرەکەری لە دەم چـــۆمی دیـــتەوە و باوەشـــی تەمـــاح و بـــووژانەوەی بە ملـــی داکرد، چونکە پەتکی لەبیر چووبوو.

کەری ڕاکـــێش ڕاکـــێش هێنـــاوە و لەبەر دەمـــی مـــام ســـەعید نمایشـی کـرد. مـام سـەعید خـولێکی بە دەوری پیـرەکەردا لێـدا و بە بێمەیلی کوتی:

- کاکە ئەوە دەڵێی بە چەندی؟

وادیـــار بـــوو مـــام ســـەعید چـــاوەڕێی ئەوەی بـــوو خـــاڵ عەبـــاس شـــتێک بڵـــێ و ئەو بڵـــێ زۆرە نـــامهەوێ. بەڵام خـــاڵ عەبـــاس بە زیرەکی ڕێگای هەڵاتنی لێ گرت و کوتی:

- خـــۆ بە مەرقەدی شـــێخی قســـەی لـــێ نـــاکەم. بۆخـــۆت وەکیـــل بە، چەندت دانا، دانا.

مـام سـەعید کە بۆخـۆی خـۆی پێوەکردبـوو و وێـدەچوو تـازە قسـەکەی لـێ بـۆتە کـوردە ناموسـی، بە خەیـاڵی خـۆی ویسـتی نرخێکـی وا بڵـێ کە خاڵعەبـاس دڵـی بێشـێ و بڵـێ نایـدەم، هەربۆیە بە مینگە مینگێک کوتی:

- کـاک عەبـاس دەڵـێم کەرەکەت زۆر پیـرە خـۆ بکـوژێ هەر سەد تمەنی دەکا.

خاڵعەبـاس لەخـودا ویسـت، بە بـێ ئەوەی وا پێشـانبدا کە شاگەشکە بووە کوتی:

- یەک قسەشی لێ ناکەم یارەبی خێری لێ ببینی.

مـام سـەعیدی بێچـارە کە کـیش و مـات ببـوو، دیسـان هەوڵیـدا خۆ دەرباز کاتەوە.

- کاک عەباس ئێستا هیچم پێنییە بددەمێ. دەبێ قەرز بێ.

- کـورە هـیچ خـۆت نـاڕاحەت مەکە. ئەوە دەچیـیە شـاری، ئەگەر شـتەکەت فرۆشـت پـووڵەکەم بـۆ بـدە بە فـلان حـاجی، دوکـانی هەیە، بڵـێ ئەوە قەرزەکەی عەباسـی مـرۆتێیە. بڵـێ ئەوی دیکەشی بۆ لەسەر چاوم دادەنێم.

بە ناچـاری مامسـەعید پیـرەکەری وەپـێش خۆیـدا و ڕۆیـی و بـووە هـۆی ئەوەی کە یەکێـک لە سـەرکەوتووترین بیرەوەرییەکانی خاڵ عەباس بخولقێ.

- بەسەری تۆ پیرەکەرم وا لێ قاییم کرد کەرەکەش بۆخۆی پێی سەیر بوو.

پاش ئەو زنجیرە ڕووداوە خاڵعەباس مەیلی شاری نا و مەگەر بە هەڵکەوت دەنا ڕووی تێنەدەکرد و کوڕەکانی کە ئێستا جحێڵ بوون لە جیاتی وی، وەدوای کار و پێداویستییەکان دەکەوتن. ژیانی خاڵعەباس بەوجۆرە بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی دەنگۆی ئەوە بڵاو بۆوە کە شار شێواوە و خەڵک دەیانهەوێ پادگانی شار تالان بکەن. هەر ئەوەندە کورتە دەنگۆیە، بەس بوو بۆ ئەوەی هەستی کێشەپێخۆشی خاڵ عەباس وەخەبەر بێتەوە و خۆ بگەیێنێتەوە شار.

پێویستە بۆ مێژوو پشتڕاست بکرێتەوە کە خاڵ عەباس بە پێی ئەو زانیارییانەی ئێستا لە ئارشیوی نەخۆشخانەی شار دەست دەکەون، دەورێکی یەکجار کاریگەری لە شۆڕشدا هەبوو. یەکەم کەس بوو کە لە تالانی پادگاندا تایەکی گەورەی ئارد بە کۆڵێ هێناوەتە دەرێ، کەچی لە ئاکامی هرووژمی لە ڕادەبەدەری جەماوەر وەبەر پێیان کەوتووە، لە هۆش چووە و سێ پەراسووی شکاوە.

ئەو گێــڕانەوەیە، هیچ کــات بەشــێک لە بیرەوەرییەکــانی فەرمــی خــاڵ عەبــاس نەبــووە و قەت قاییــل نەبــوو لە حــزووری خۆیــدا باسی لێوەبکرێ. وەک گێڕانەوەیەکی دژبەر هەمیشە دەیکوت:

- کــوڕە خــۆ ئەمــن ئاگــام لەو بەزمەی نەبــوو. چووبــووم ســجیلی بگۆڕمەوە.

کەس مەیلــی لێنەبــوو باســی چــۆنییەتی ســجیل گــوڕینەوە بکــات، چـــونکە وەک هەمیشـــە لەئاکامـــدا وای ســـەر لێدەشـــێواند کە واش نەبا هەر دەیکوت وایە.

ئەگەرچــی ئەو سروشــتی کێشەپێخۆشــی هەتــا ئــاخری تەمەنــی هەر دەگەڵ بــوو، بەڵام چەنــد ســاڵ دواتــر شــەڕی هەژاری وای لێکــرد ســەرەڕای ئەوەی کێشــە و ئــاڵۆزی بــاڵی بەســەر وڵات کێشـــابوو، تەرکـــی مەوتەن بکـــا و بـــۆ ئەوەی کێشـــەی زگ چارەســـەر بکـــا، لە کوورەخـــانە بگیرســـێتەوە. ئەو شـــوێنەی کە خولەکـــانی عێرفـــانی بەســـەرکەوتوویی لـــێ تێپەرانـــد و تـــا مــاوەیەک پێیوابــوو بۆخــۆی تەنیــا ســەرچاوەی گێــڕانەوەی هەمــوو کــارە ناوازەکــانییەتی، بەڵام دواتــر هــاتە ســەر ئەو بــڕوایەی کە بڵێ:

- ئەگەر خــودا خۆشــی نەویســتی ژن و منــداڵیش لێــت دەبــن بە سیخوڕ و لێرەولەوێ سوڕت دەدرکێنن.

کوورەخـــانە تەنیـــا شـــوێنێک بـــوو کە چرکەچـــرکەی کاتەکـــانی گرینـــگ بـــوون. ڕۆژەکـــانی بـــۆ خۆخافڵانـــدن و شـــەوەکانی بـــۆ بەخەبەرمـــان نەدەبـــوون. هەر ئەوە وایکردبـــوو هەتـــا مـــاوەیەک، سروشـــتی خاڵعەبـــاس تووشـــی شـــڵەژان ببـــێ و لە ئەنجامـــدا کاردانەوەی توندی هەبێ.

لەتاریـــکوڕوونی بەیـــانیڕا کە دەســـتبەکار دەبـــوو، لە بـــن لێـــوان قســـەی دەکـــرد هەتـــا ڕۆژهەڵـــدەهات. وردەوردە کە تاوبـــان خـــۆش دەبـــوو دەنگـــی قســـەکردنەکەی بڵینـــدتر دەبـــوو. نزیـــک گەرمـــای نیـــوەڕۆ، ئیـــدی نەڕانـــدن بـــوو. نـــاوەرۆکی هەمـــوو ئەو ســـێ قۆنـــاغە، جنێـــــو بـــــوو کە بە شـــــێوەیەکی سەرســـــوڕهێنەر تـــــازەگەری تێـــداکردبوون و ئەو شـــتانەی دەگـــرتەوە کە بە جنێـــودانی ئاســـایی دەربـــــاز دەبـــــوون. نەیدەهێشـــــت داروبەردیـــــش بێـــــبەش بـــــێ. هەرکەســـێک بە هەرجۆرێـــک لەو پـــیلانەدا بەشـــدار بـــووە و بـــۆتە هـــۆی ئەوەیـــکە تووشـــی کوورەخـــانە بێـــت، پڕیشـــکەیەکی بەر دەکەوت.

خـــــاڵ عەبـــــاس کە هەمـــــوو عـــــومری ڕقـــــی لە خەوی پـــــاش نیوەڕۆیـــــان بـــــوو و بە فێعلـــــی ئاغایـــــانی دەزانـــــی، نیوەڕۆیـــــان ســـەرخەوێکی چـــاکی دەشـــکاند. پـــاش لەخەو هەســـتانی هێـــور دەبۆوە هەتا ڕۆژی دواتر.

چەنــدجار بەربــوونەوەی پــێچوکڵاوە هەمیشــە ئــاڵۆزەکەی و دە قــوڕێ کەوتنــی، وایکــرد چیــدی لەســەری نەنێــتەوە و بە بەئامــانج گرتنــی گــۆڕی خێــوی، ماڵئــاوایی لــێ بکــا. وەک جێگــرەوەیەک بــۆ پــێچوکڵاوەکەی لێچکەیەکــی کەســکی لە ســەری دەهاڵانــد بــۆ ئەوەی ســەررووت نەبــێ. یەکێــک لەو دوو شــتەی کە بــۆ بەرگ پۆشــینی پیــاوی، بە عەیــب دەزانــی. ئەوی دیــکە، دەبەرکردنــی کراسی بێ کەوا بوو.

خــاڵ عەبــاس ئەگەرچــی وەک ســاڵان نەمــابوو و عەجەمــی زۆر دەدیــــــت، ئێســـــتاش پێیوابـــــوو هەرچـــــی عەجەمە دەوڵەتە. کــاریگەری بەرمــاوی ترســی ژانــدرمان دە نــاخی مێشــکیدا بــێ یــا شــتێکی تــر، بە دیتنیــان لە ئانوســاتدا دەگــۆڕا و دەبــوو بە پیــاوێکی دیــــکە. هێــــدی و لەســــەرخۆ بە شــــێوەیەک کە هەر وشــــەی حەوت قوڵتی دەدا هەتا لە قورِگی دەهاتە دەرێ.

خــــاوەن کوورەخــــانە کە ئەو ڕواڵەتەی دیتبــــوو، ئــــاوا پیــــاوێکی لەســــەرخۆ و هێــــدی، لەولاشــــەوە شــــاڵێکی کەســــک بە ســــەرێوە، وێــــدەچوو بــــاوەڕی کردبــــێ کە پیاوچــــاکە، هەربــــۆیە زۆری قەدر دەگرت و لەکاران ڕاوێژی پێدەکرد.

خاڵعەبــاس کە بــۆ ســەلماندنی خــۆی لە مەیــدانی ڕاســتی و پاکیــدا هەمــوو هەلێکــی دەقــۆزتەوە، شــازترین دەوری خــۆی ئەو ڕۆژە گێــڕا کە کــاتژمێر دەی بەیــانی خەریــک بــوو شــیلانگی

ئـــاوی لە ســـەری شـــێرەکەی دەبەســـت. بە هـــۆی ئەوەیـــکە شـێرەکە دەقووڵـدا بـوو، لەسـەر چـۆک دانیشـتبوو و سـەری بـۆ نێـو قـــوڵکەکە بردبـــووە خـــوارێ. لە دوورڕا دیتـــی کـــابرای خـــاوەن کوورەخـانە خەریـکە بەلای ویـدا تێـپەڕ دەبـێ. خاڵعەبـاس بەبـێ ئەوەی بزانـــێ چ دەمە، یەکســـەر حـــاڵەتی نـــوێژی گـــرت و وای پێشـــــاندا کە خەریکـــــی نـــــوێژ کـــــردنە. کـــــابرای عەجەم بە سەرسوڕمانەوە بە تەنیشتیدا تێپەڕ بوو و کوتی:

- ماشاالله ماشاالله!! چه فرشته‌ای؟! حاجی التماس دعا.

پـــــاش تەواوبـــــوونی لەو خۆنوانـــــدنە، کـــــوڕە گەورەکەی کە لە کابرای زیاتر سەری سوڕمابوو کوتی:

- بابە ساعەت دەی بەیانی نوێژی چی؟

خاڵ عەباس بە سرتێکی ئاماڵ قەڵسی فەرمووی:

- بێـــدەنگ بە هەتیـــوە! نـــوێژ ســـاعەتی بـــۆ چیـــیە. ئەتـــۆ فێـــری خۆشوردنەوەی بە لە نوێژی من گەڕێ.

ئەو ڕێـــز و ڕوانیـــنەی کـــابرای عەجەم، وەک تەنیـــا هۆکـــاری ســـــەلمێندراو، وردەوردە کـــــاریکردە ســـــەر هەڵســـــوکەوتی خاڵعەبـاس و لە مـاوەیەکی کورتـدا جبەخـانەی لە جنێـو خـاڵی بـــوو. وا چووبـــوو دە نـــاخی دەورگێـــڕانەکەی کە دوای دوو مانـــگ کەس خاڵعەباســـی ڕاســـتەقینەی لە بیـــر نەمـــابوو. کـــاریگەرییەکە

بەجۆرێــک بــوو کە ئەو دەورە تــایبەتەی هەتــا دوای تەواوبــوونی کــاری کــوورە و گەڕانەوەشــی هەر گێــڕا. ئەو کــاتەی هەرچــی لە دێ هەیبــوو، جــگە لە پــارچە زەویــیەک، هەمــووی فرۆشــت و هــات بــوو بە جیرانــی ئــێمە. هەر ئەو ســەروبەندەش بــوو کە هەســتی شــانازیکەرم بە بــوونی هەڵکەوتــوویەکی ئــاوا لە نێــو خــزم وکەسدا، وەکوڵ هات.

پێشــتر چەنــد جــارم زیــاتر نەدیتبــوو، بەڵام ئەوکــات دڵنیــا بــووم کە قەت شــاڵی بەســەرەوە نەبــووە و ئەو ئــۆینەی تــازەگەرییە. هەر وەک دواتــر کە وردەوردە خــاو دەبــۆوە و دەهــاتەوە ســەر فۆڕمی پێشووی، بینیم شاڵەکەی غەیب بوو.

خاڵعەبــاس وەک ئەوەی چــاوەڕوان دەکــرا، لەمــاوەی ئەو خــاو بــوونەوەی کە بە شــێوەیەکی هەنگــاو بە هەنگــاو ڕوویــدەدا، یەکەم نمایشــی خــۆی لە قۆنــاغی ســەردەمی نــوێ، بــردە ســەر شانۆ و لەوکاتەوە تیژایی سرنجی منی خستە سەر خۆی.

مانگێــــک نەدەبــــوو ببــــووینە جیــــران کە چەخمــــاخەی ســەردانیکردنی ئێــوارانی لیــدا و هەتــا لە ژیانــدا مــابوو نەیهێشــت وەڕەزی بکەیــــن. وا ڕاهــــاتبووین کە شــــوێنی چارەســــەری کێشــــەکانی خاڵعەباســــیش هەر مــــاڵی ئــــێمەیە و دەبــــێ بە کێشەی خۆمانی بزانین.

وەک لەبیــرمە پــاش کێشــەی نیشــتەجێ بــوونی، دووهەم کێشــە کە هـــاتە نێـــو ئەجێنـــدای کۆبـــوونەوەی ئێـــواران، پرســـی قوربـــانیکردنەکەی بـــوو. هێشـــتا لە ژێـــر کـــاریگەری عێرفـــانی هاوردەی بوو کە بۆ پرس‌وڕا هاتە کن دایکم.

- ئیشاڵڵا ئەوە بە تەمام قوربانی بکەم. خێری بابم.

دایکـــم لە بـــابی خـــۆی بـــرای نەبـــوو هەر بـــۆیە هەمیشـــە ئەو کـــاکەی لەلا گرینـــگ بـــوو، بەڵام ئەو قســـەی کـــاکی زۆر وەبەرچاو گرینگ نەهات، چونکە بابی وی نەبوو.

- خودا بۆت بگەیێنێت.

خاڵعەبـــاس وەک ئەوەی هەســـتی بەو بێهەڵوێســـتییە کردبـــێ، ئەوجـــار لەبەر خـــۆیەوە بەبـــێ ئەوەی ڕووی قســـەی دەگەڵ کەس بێ، بەڵام بەجۆرێک ئامادەبووان بیبیسن کوتی:

- ئەرێوەڵڵا! با خێری دایک و بابم بێ.

کـــاریگەری ئەو قســـە ناڕاســـتەوخۆیە لە ســـەر دایکـــم، لەکـاریگەری ڕووخـانی یەکێتـی سـوڤییەت لەسـەر بلـۆکی ڕۆژئـاوا زیـاتر بـوو. بەجۆرێـک دایکـم، بە پـێچەوانەی ڕۆژئـاوا کە هەتـا مـــاوەیەک بە گومـــانەوە دەیـــانڕوانییە ئەو پرســـە، بەوپەڕی خێرایـی هەڵوێسـتی گـرت و بەبـێ سـرنجدان بە بـاری ئـابووری خاڵعەباسی، پاڵپشتی ئەو کارە خێرخوازییەی کرد.

- یارەبی خودا بۆت بگەیێنێ. وەڵڵاهی زۆرم پێخۆشە. ئیشاڵڵا چ دەکەیەی؟

خاڵعەباس کە دیتی پاڵپشتێکی ئاوا بەهێزی لەلایەن دایکمەوە لێدەکرێ، نوتقی‌کراوە و وردەکارییەکانی خستە ڕوو.

- دەڵێم جوانەگایەک بکەمێ ئەویش ئەو ژنەتیوە دەڵێ دایکم مرێ، بابم مرێ، نەمهێشتووە و ناهێڵم.

- ئەیارڕۆ بۆ؟

- دەڵێ هەتا قەرزی ئەو زەمینەی نەدەیەوە، کاری وا بکەی ئاور دەخۆم بەردەدەم.

کە نێوی قەرزی هات، بابم قوت بۆوە و هەر قوونەجوڵەی بوو بۆ ئەوەی بە جۆرێک خۆ دەباسەکەی باوێ.

- جاکاکعەباس خۆ مەجبوور نی هێندە فشار بۆخۆت بێنی، جوانەگایەک بۆ؟ لەقەدەرخۆت. ئەگەر نیشتە ئەوساڵ مەیکە چییە، با بۆ ساڵێکی دیکە بێ.

دەو بەینەدا چاووبرۆیەک لە نێوانی دایک و بابمدا ئاڵوگۆڕ کرا کە چی لێ تێنەگەیشتم.

- کاکە براژنیشم هێندەی دڵ چکۆلەیە، دەنا ئەوەی بۆ چییە. خێرە ئیدی با خێری دایک و بابی ئەویش بێ.

خـاڵ عەبـاس کە وێـدەچوو هۆشـی لە جێیەکـی دیـکە بـێ، هەروا کە خەریـــــک بـــــوو دەنـــــکە دەســـــحێبەکانی ئەودیواودیـــــو دەکرد،کوتی:

- پیاو بڵێ چی! کەس دە ژنان ناگا.

بـابم کەڵکـی لەو وڵامە کـورتەی خاڵعەبـاس وەرگـرت و نـۆرە قسەی گرتە دەست.

- کـوڕە جـا کـاکە ئەویـش ڕاسـت دەکـا. بە قەدەر تـۆ بە کـارێوە مانـدوو بـووە. نەچـی بڵێـی ئەوە لەبەر پـووڵەکەی خـۆی وا دەڵـێ. خـــــۆ بە مەرقەدی حەزرەتـــــی غەوس، ئەو پـــــووڵەم هەر بە خەیـاڵیش دانـایە. بەتـۆ بـێ وەدەزانـم بە خـۆمە. ئەوە شـکور زەمینـت پێکرِیـوە. حەزێ دەکەی دە سـاڵی دیـکە بمـدەوە. خـۆ ئێمەماڵمان بەش نەکردووە!

ئەگەرچـــی بـــابم مەبەســـتی ڕاســـتەقینەی ئەوە نەبـــوو و ئەو قســـەیەی لە ترســـی دایکـــم وەک پاکـــانەیەک کـــرد، بەڵام خاڵعەباس ئەو هەلەی زۆر بەباشی قۆزتەوە.

- کوڕە بابم دەزانم! لە تۆ خاترجەمم.

بـۆم پرسـیار بـوو کە خاڵعەبـاس بەڕاسـتی مەبەسـتی هەر ئەوە بـوو یـا خـۆی لە گێـژی دابـوو، چـونکە سەروسـیمای بـابم، لە دووررِا دیـار بـوو، خەمـی پـووڵەکەی بەقەرز دابـووی بە وی،

هــــۆی هەوەڵ و ئـــاخری لە دژایەتـــی ئەو قوربـــانیکردنە بـــوو. ئەوکـــات بـــابم و خاڵعەبـــاس تـــازە ببـــوونە خزمـــی چـــاک و هاتوچۆیـان زۆر ببـوو و کـاتی زۆرتـر پێویسـت بـوو، بـۆ ئەوەی لە یەکتر حاڵی بن و بۆ ماڵی دنیا، تخوون یەک نەکەون.

ئەورۆژە خـــاڵ عەبـــاس بە بـــێ ئەوەی لە بڕیـــاری خـــۆی، سەداســـەد دڵنیامـــان کـــاتەوە ڕۆیشـــت، بەڵام وەک ناوەنـــدەی عەمەلیـات، چەنـدجاری دیـکە بەو دەسـتوورەی، لە مـاڵی ئـێمە دانیشـتن هەبـوو. هەڵـبەت لە مـاڵی خۆشـیان دانیشـتن دەکـرا بەڵام بەهـــۆی ئەوەیـــکە هەرزوو تونـــدوتیژی تێـــدەکەوت، کۆبوونەوەکە بۆ ماڵی ئێمە، وەک یاریگای بێلایەن دەگوازراوە.

لە سـەرەتادا شـەڕەکە لەسـەر بـوون و نەبـوون بـوو. قوربـانی هەبـێ یـا نەبـێ، پرسـەکە ئەوە بـوو. یەکەم جـار کە خـاڵ عەبـاس ئەو پرســـەی ورووژانـــد، لە لایەن بنەمـــاڵەوە کـــاردانەوەی زۆر دڕنـدانەی لـێکەوتەوە و بەتونـدی ئیـدانەیان کـرد. دەیـانکووت ئەوسـاڵ لە کوورەخـانەی پشـتمان شـکاوە دووتمەنمـان پەیـدا کـــردووە، چـــووی زەمینـــت پێکرێـــوە، کۆڵێکیشـــی لەســـەر قەرزداری، قوربـانی چـی! کاتێـک خاڵعەبـاس نەیتوانیبـوو بە پشـتیوانی حـاڵە عیرفـانییەکەی قەناعەتیـان پێبێنـێ، هـاتە مـاڵە ئـێمە و وەک بـاس کـرا بەو مەرجەی خێـری دایکیشـی بـێ، پشـتیوانی دایکمـی مسـۆگر کـرد، هەرچەنـد پشـتیوانییەکەی دایکـم دواتـر بە هـۆی بـۆڵەی بـابم جرجـی تـێکەوت و ئەوجـۆرەی

شـایانی هەیبەتـی قسـەی خـاڵ عەبـاس بـوو، پێـداگری لەسـەر نەکرد.

خاڵعەبـاس لە ژێـر کـاریگەری بـاری دەروونـی ئەوکـاتی، قاییـل نەبـوو بسـتێک پاشەکشـە بکـات، بەتـایبەت کە تووشـی هەرکەس ببـوو ئەو نەقـڵەی بـۆ کردبـوو و هیـوای بەشـە خێـری دە دڵـی هەمـوو جەمـاوەر هاویشـتبوو. ئەو بـارودۆخە چەقبەسـتوویە بـۆ دوو حەوتـوو هەر ئـاوا مـاوە و بە بـێ هـیچ تێکهەڵچـوونێکی یەکـلاکەرەوە، لەشـکر بەرامـبەری یەک وەسـتابوون. بـابم وەک کەسـێک کە ئەو قوربـانیکردنە بە دڵنیـاییەوە کـاریگەری ڕاسـتەوخۆی لەسـەری هەبـوو، کەوتە نـاوبژیوانی و لە هەلێـک دەگەڕا تـاوەکوو خـۆی بەو سـەردێرە پێناسە بکا.

ئەو کـات پـاش چەنـدین سـاڵ دابـڕان لە یـارییە خۆماڵییەکـان، خاڵعەبـاس دەسـتی بە دامە کردبـۆوە و تاوناتاوێـک دەگەڵ بـابم بـۆی دادەنیشـتن. بەهـۆی سروشـتی دامەوە، بـابم چـاوڕووی لە ئاسـت خاڵعەبـاس کە دەپێشـدا هێنـدێکی شـەرم لێـدەکرد کرابۆوە و ناڕاستەوخۆ زۆر قسەی دەکرد.

- کاک عەباس چاکیشی دەکەی!

- کوڕە بە مەرقەدی شێخی ئیشتیام لێبێ، نایەڵم ببزووی.

بـــابم قەت عـــادەتی نەبـــوو تـــاریفی کەس بکـــا بە تـــایبەت خاڵعەبـــاس. بەڵام لەو کـــاتەدا بـــۆ ئەوەی زەفەر بە ســـەنگەری بەرگری خاڵعەباس بەرێ پێویستی بەو تاریفە بوو.

- ئەرێ کاک عەباس دەگەڵ قوربانییەکەی چت کرد؟

- دەیکەم ئێشاڵڵا.

- ئەدیماڵێ دەڵێن چی؟

بـــابم وەک ئەنـــدامی فەخـــری و بەردەوامـــی ئەنجـــوومەنی چارەســـەری کێشـــە هەڵپەسـێراوەکانی مـــاڵە خاڵعەباســـی، زانیـــاری سەداســـەدی لەســـەر بـــابەتەکە هەبـــوو و لێـــرەدا مەبەســـتی تەنیـــا خولقاندنی کەشێکی لەبارتر بۆ پێناسەکردنی خۆی بوو.

- ماڵ ... خوارد. چ کارەن؟

لێـــــرەدا دەرکەوت کە تـــــاریف کـــــردن، وەک خـــــاڵی لاوازی خاڵعەبـــاس لەو بـــابەتەدا کـــاریگەر نیـــیە و بەو فەرمایشـــەی پێشـــانیدا کە زۆر پـــیس ســـەنگەری گرتـــووە. بەڵام بـــابم قاییـــل نەبوو پاشەکشە بکا و لەسەر ئامانجی خۆی پێداگر بوو.

- ئەرێ بـــۆ نەچـــین ســـەرێکی کـــاک ســـمایلی بـــدەین. ئەورۆ مەڕە ئەســـتێورێکی هێنـــابوو، ماشـــەڵڵا دەتکـــوت کەڵە. دۆســـتە، مایەمـــان بۆ دادەنێ.

خاڵعەبــاس کە تــا ئەوکــاتە بــابمی وەک یەکێــک لە ســەربازانی لەشــکری دژبەر دەناســی، بەو پێشــنیارە تووشــی شــۆک بــوو، بەجۆرێــک ســەرەتای دوو ڕســتەی تــێکەڵاو کــرد و لەپێشــدا ویســتی هەڵوێســتی ڕابــردووی بــابمی وەبیــر بێنێــتەوە، بەڵام هەر ئەوەنــدی کــوت کە (ئەتــۆ نەددەکــوت)، و دواتــر ڕســتەکەی گۆڕی و کوتی:

- کاکە مەڕم بۆ چییە؟ ئەمن جوانەگای دەکڕم.

لە شــێوەی کــوتنەکەیڕا وێــدەچوو زۆر پێــداگر نەبــێ، ئەگەرچــی بــــابم وەک ئەوەی قســــەی وی هەر نەبیســــتبێ، ئەوەی بۆخــــۆی مەبەستی بوو، وەک بابەتی سەرەکی خستییە وتوویژ.

- کــوڕە کــاری وەی نیــیە! ئەتــۆ وەرە بیبیــنە، بــزانە چــۆن دڵــت دەیگرێ! زەلامێکە...

لە درێــژەی تاریفاتەکەیــدا پەڕێــوە ســەر بــابەتی ئــایینی و قســەی مامۆســتای لە باشــتر بــوونی مەڕ، وەک بەڵــگە هێنــاوە. تەنــانەت بە ئامــاژە بەوەیــکە ئینســانی نەدار بــۆی هەیە کەڵەبــاب قوربــانی بکــا، مەڕی لەپــێش چــاوی خاڵعەبــاس هێنــدە زەلام کــرد کە یەکسەر قەناعەتی پێ هێنا دەستبەرداری جوانەگا بێ.

هەرچەنــد بــابم بە ئامــانجی خــۆی کە پێشــگرتن لە قوربــانی خاڵعەباســــی بــــوو نەگەیشــــت، بەڵام وەک دەڵــــێن زەرەر لە

نیوەشــــڕا بگەڕێــــتەوە هەر قــــازانجە. لانــــیکەم خاڵعەبــــاس ئەوەندەی دیکە قەرزدار نابێ.

ئەو فەلســەفەی زەرەر و نیــوە زەرەرەی بــابم بــۆ ئەوەی دەبــوو دەگەڵ بنەمــاڵەی خاڵعەباســی دانوســتاندنی لەســەر بکــرێ. هەربــۆیە بــابم وەک بەرپرســیارێتێکی نــافەرمی شــانی وەبەردا و بــۆ وتــوویژ و هەڵســەنگاندنی، دوور لە چــاوی خــاڵ عەبــاس، ســەردانیکردن. ئەگەرچــی نــاوەرۆکی بەرنــامە پێشــنیارکراوەکەی بــابم بــۆ مــن دیــار نەبــوو، بەڵام وێــدەچێ هەر بەو فەلســەفەیە قەنــاعەتی پــێ هێنــابن. هەرچەنــد بۆخۆشــیان لێیــان ســوور بــوو کە ئەگەر خاڵعەبــاس کوتــوویەتی قوربــانی دەکەم، هەر دەیکــا، کەوایە ئەو کەڵەی بــــابم ئامــــاژەی پێکــــردووە دەتــــوانێ جێگرەوەیەکی باش بێ.

بەو جــۆرە هەوڵ و مانــدوو بــوونەکەی بــابم تــا ڕادەیەک ســـەرکەوتوو بـــوو و قەنـــاعەتی پێهێنـــان کە وەک یـــارییەکی دووسەر براوە، بە کەڵەکەی بابم ڕازی بن.

کەڵ کـــرِدرا و لە مەڕاســـیمێکی پڕشـــکۆدا بە ئامـــادەبوونی دەروجیــران نمــایش کــرا. زانیــاری تەواوی لەســەر بــڵاو کــراوە بە جۆرێــک کەم کەس لەو گەڕەکە هەبــوو کە نەزانــێ خاڵعەبــاس ئیشــاڵڵا دە ڕۆژی دیــکە قوربــانی دەکــا. ئەو چەنــد کەســەش کە بە هەر هــۆیەک ئاگــادار نەبــوون، دەیــانتوانی لەو چەنــد ڕۆژەیــدا

کە هەتا جێژنی قوربان مابوو، بە تێپەڕبوون بە کۆڵانەکەی ئێمەدا زانیاری ورد وەدەست بخەن. هەڵبەت هیچ نوسراوەیەک یا شتێکی لەو چەشنە نەبوو هەتا زانیاری بداتە ڕێبواران. لە ڕاستیدا ئەوە کەڵەکەی خاڵ عەباس بوو کە بە درێژایی ڕۆژ لە دەرکی ماڵییان دەبەسراوە بە پاساوی ئەوەیکە حەوشەکە پیس دەکا. لەوانەیە هەر واش بووبێ، بەڵام کەڵ ئەگەر کەڵ بێ دەتوانێ کۆڵانیش پیس بکا. ئەگەرچی ئەو کەڵەی ئەمن دیتبووم دەیتوانی سێ مانگیش بە بێ ڕیان بلەوەڕێ، بەڵکوو پەراسووی بشارێتەوە.

ڕۆژ و نیوێکی مابوو بۆ جێژن کاتێک بە کۆڵاندا تێپەڕ بووم و بە پێچەوانەی ئەو شتەی چاوەڕوانم دەکرد، مەڕ نەمابوو. کاتێک ئەو ڕووداوەم دەگەڵ دایکم هێنا بەرباس، بە سەرسوڕمانەوە کوتی:

- ئەیارۆ! بۆخۆیان نەیانکوژبێتەوە بە ئێمەشیان نەکوتبێ!

ئەو کاردانەوەی دایکم زۆر جیاواز بوو لەو شتەی پێموابوو لەو جۆرە کاتانەدا مەزەندەی بۆ دەکرێ، بۆ وێنە دزرابێ. بەڵام ئەمن وەک منداڵێک زۆر لە دنیای سیاسەت ناشارەزا بووم و هێشتا هەستم بە پێگەی قوربانی و بەشە خێر لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردەواری نەکردبوو.

یەکەمجـار بـوو کە دایکـم بە هەواڵێـک لەزمـانی مـنەوە، ئـاوا هەسـتیار دەبـێ و پێـداگرانە لە چـۆنیەتی هەواڵەکە دەکـۆڵێتەوە. سـرتوخورتی ئەو ئێـوارەیەی دەگەڵ بـابم وادیـار بـوو بە قەنـاعەتی نەگەیانـدبوو، بەتـایبەت کە ئەو ئێـوارەیە خاڵعەباسـیش دیـار نەبـوو. هەربـۆیە دەگەڵ مـاڵ نووسـتنان چـووە دەرکـی مـاڵی خـاڵ عەبـاس و گـوێی بە دەرکە وەنـا بـۆ ئەوەی دەنگێـک ببیسـێ کە مەزەنـدەکەی پـێ پشتڕاسـتکاتەوە. کاتێک هاتەوە لە وڵامی پرسیاری بابمدا ئەوەندەی کوت:

- چرایان دایسێ بەڵام هەستوخوستیان نایە.

بـابم ئەوجـار هـاتبووە سـەر بـاری کەیخـودایەتی و چەنـد مەزەنـدەی بە قـازانجی خاڵعەبـاس خسـتەڕوو. وەک: چـت لێـداون مـاڵی خۆیـانە! کـابرا پێـی خۆشـە ئـاوا قوربـانی دەکـا بەتـۆچی! یـا خـۆ ئەتـۆ کەیخـودای کـابرای نـی... بەڵام دایکـم وەک کـاردانەوەیەکی خێـرا بـابمی بە تەواوی چەک کـرد و لەوێی دانا.

- ئەتـۆ دەنگـێ مەکە مە! ئەو بەزمە هەمـوو دەبـن سـەری تـۆ دایە. چـووی ئەو دێـڵە مەیمـوونەت هانـدا لەسـەر کاکمـت کـردە کەیخودا، ئەلانیش لە ئاست وی فزەی نایە.

ئەگەرچـی بـابم هیچـی لە دوو نەهـات و بە هەر هـۆیەک نەیویسـت دمبەدمەی دەگەڵ دایکـم بکـا، بەڵام ئەو

پاشەکشـــــەیەی بـــــابم، وێـــــدەچوو لە لایەن دایکـــــمەوە وەک هەڵکردنــی گڵــۆپی ســەوز، بــۆ ڕووبەڕووبــوونەوەی یەکــلاکەرەوە دەگەڵ خــاڵۆژنم، ئەژمــار کرابــێ، چــونکە دەگەڵ بڵاوکــردنەوەی بەشـــــە خێـــــر لە ڕۆژی دواتـــــردا و ڕاســـــت دەرچـــــوونی مەزەنـــــدەکەی، دایکـــــم، دەســـــتی کـــــرد بە بڵاوکـــــردنەوەی پڕوپاگانــدای ژەهــراوی لە دژی ئەو خێروخێــراتە. ســەرەڕای زۆر شــتی گرینگتــر، تیژایــی گازنــدەکانی دایکــم، کەوتبــوو ســەر ڕادەی قورســایی بەشــەخێرەکە، بەجۆرێــک لەهەر وتووێژێکــدا دەپێشــدا ئەوەی وەبیر کەسی بەرامبەر دێناوە.

- بەقەد لاگـــونێکی چەرمەچەقـــاڵتە، دە کـــاغەزی پێچـــاوە! ئەوە بەشەخێری بۆ خوشکی هێناوە!

دایکــم وەک تەنیــا خوشــکی مــاوی خاڵعەبــاس کە دراوسێشــی بــوو، چــاوەڕوانی ئەوەی دەکــرد کە لەو بــۆنەیەدا نەتەنیــا بەشــدار بــێ، بەڵکــوو فەرمانیشــی بەدەســت بــێ، بە تــایبەت پــاش ئەو پشـــتگیرییەی کە لێی‌کردبـــوو. بەڵام بە پـــێچەوانە، ئەوە دژبەری ســـەرکی ئەو قوربـــانیکردنە بـــوو کە لە ئاکامـــدا جـــڵەوی گـــرتە دەســـت و بە جۆرێـــک جێبەجێی‌کـــرد کە چەخمـــاخەی شـــەڕێکی ساردی چەند ساڵەی لێدا.

ئەو شـێوە قوربـانیکردنە، لە ئاکامـدا پـێگەی سیاسـی دایکمـی زۆر بەهێــز کــرد بەتــایبەت کە دەرکەوت جــگە لەو دەدوازدە مــاڵەی

دراوسـێمان، کەسـی‌تر بەشـەخێری خاڵ‌عەباسـی نەبینیـوە. بە ڕەسـمی کـوردەواری ئەوجـۆرە کاتـانە هەمـوو کەس پەنـجەی تۆمەت بۆ لای خزمی خێزانی ڕادەدێرێ.

لەوانەیە ئەمـن تەنیـا کەسـێک بـووبم دواتـر توانیبـام ئەو تۆمەتـانە ڕەتـکەمەوە و ئەو شـەڕە سـاردە لە سـەرەتاکانی هەڵگیرسـانی بکـووژێنمەوە، بەڵام کەس گـوێی‌نەدەدامێ کاتێـک دەمکـوت: مـاڵە خاڵ‌عەباسـی مانگێکیشـە بـۆنی گۆشـتی برژاویـان لە ماڵێ دێ.

تەنیـا شـتێک کە دەیتـوانی لە زەبـری ئەو شـەڕە سـاردە کەمکـاتەوە، دووری بـوو. بە خۆشـحاڵێوە بـۆ بەهـارێ ئەو دەرفەتە ڕەخسـا و خاڵ‌عەبـاس بە دووبـارە چـوونەوەی بـۆ کوورەخانە. بووە بە کاکی دایکم.

بەهـۆی بـارودۆخی ئەو کـات, کـوڕەوی جەمـاوەر بـۆ کوورەخانـان، زۆر بەرچـاو بـوو. ئەو کـارە تەنیـا سـەرچاوەی داهـات بـۆ بەشـێکی زۆری کۆمەڵگـا ئەژمـار دەکـرا. خـاڵ عەبـاس ئەوسـاڵەش چـۆوە کوورەخـانەی و سـاڵی دواتـر و سـاڵەکانی دواتریشـی بەڵام ئیـدی ڕاهـاتبوو. تێـر بە دڵـی خـۆی عەجەم دیتبـوو و هـیچ شـتێک توانـای ئەوەی نەبـوو گۆڕانکـاری دەروونـی گەورەی تێـدا سـاز بکا.

چەنـــد ســـاڵ هەڵاتهەڵاتـــی بێحەســـانەوە، قەنـــاعەتی پێهێنـــابوو کە هەتـــا منـــداڵی لە دەوروبەری هەیە، دەبـــێ تەکبیرێـــک بـــۆ پیـــری بکـــات. هەر نەبـــێ خـــانوویەک پـــێکەوە بنـــێ. هەر بـــۆیە لەناکاوێـــک، بڕیاریدا خانوو ساز بکات.

بە بیســـتنی ئەو بڕیـــارە، کەســـانێک کە بڕیارەکـــانی خاڵعەبـــاس، ڕاســـــتەوخۆ یـــــان ناڕاســـــتەوخۆ کـــــاریگەری لەســـــەریان هەبـــــوو، کەوتـــنە ڕاوێـــژ. لەو بەیـــنەدا خاڵعەبـــاس ئەرکـــی پێوەنـــدی نێـــوان ئەو دوو گـــرووپەی لەســـەر شـــان بـــوو. هەرشـــتێک لە مـــاڵی خۆیـــان وتـــوویژی لەســـــەر دەکـــرا، بـــۆ ســـبەی ئێـــوارێ لە مـــاڵی ئـــێمەش ســـەرلەنوێ دەخـــراوە بەر بـــاس. ڕاوبۆچـــوون زۆر ئـــاڵوگۆڕ کـــران، بـــــێخەبەر لەوەیـــــکە ئەو بۆچوونـــــانە بـــــۆ خاڵعەبـــــاس، دەوری مەجلـــیس خۆشـــکردنیان دەگێـــڕا و بۆخـــۆی لەمێـــژ بـــوو هەمـــوو قۆناغەکـــانی پرۆســـەکەی دارشـــتووە. بەشـــی ئەو کەســـانەی کە بڕیارەکـــانی خاڵعەبـــاس، ڕاســـتەوخۆ یـــان ناڕاســـتەوخۆ کـــاریگەری لەســـەریان هەبـــوو، دواتـــر، تەنیـــا شـــەڕەچەقە بـــوو بـــۆ ڕازیکردنـــی خاڵعەباس بۆ نەرمینواندن و ئەنجامدانی هێندێک ڕێفۆرم.

پـــاش سەنگوســـووکێکی زۆر، بە ڕەزامەنـــدی خاڵعەبـــاس، وەســـتا ڕەحـــیم بانگهێشـــت کـــرا بـــۆ ئەوەی هەتـــا ســـەرما نەهـــاتووە، خاڵعەباســـی دامەزراو بکـــا. خاڵعەبـــاس کە پێیوابـــوو شـــانازی بە جەمـــــاوەر داوە کە خـــــانووی ســـــازدەکا، دەگەڵ گەیشـــــتنی

وەستارەحیم هەر لە ڕێوە قسەی یەکلاکەرەوەی خۆی دەگەڵ کرد.

- وەستا گوێت لێبێ دەڵێم چی! زیاترم لێوەرگرە و بە دڵی منی بکە. ئیدی بەمەرقەدی شێخی، مۆدە و مۆتەم لێدانێیەوە نایەڵم خشتی لەسەر خشتی دابنێی.

وەستا بە مۆدی ئەوکاتی کە وەستا و شاتر و شۆفیرتاکسی ئاغایەتیان دەکرد، پێیوابوو ئەو کارەش هەر بەو ڕوانینە دەکا، بەڵام بەو زەبرەی خاڵعەباس نیشانیدا هیچی پێنەما، سەیرکردنی خاڵعەباس نەبێ.

- چاوم بۆ لێدەکەی، هەروایە ئیدی! خۆ بە ماچم بۆ ناکەی! ئەگەر پێتدەکرێ بڵێ دەیکەم، نۆکەرێشت دەکەم. ئەتۆ وەستای، لە شتەکەی دەزانی، پێمخۆشە شتەکەم وا بۆ بکەی، سبەی ئیرادی لەمن نەگرن، نێوی بابم نەهێنن بۆ وەستای گرتوومە. دەنا ئەمن لەسەر دڵی تۆم، چۆنی چاک دەزانی ئاوای دانێ. پیاو نابێ هێندەش جوابی ژنوژالان داتەوە...

وێدەچوو وەستا کوتوپڕ تووشی حەبەسان بووبێ و لە کاردانەوەی شیاو دڕدونگ بێ، چونکە دەگەڵ کۆتایی پێهاتنی وتارەکەی خاڵعەباسی، پڕی بە گێچەکە داگرت و بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ، دەستیکرد بە کێشانی نەخشەکەی لەسەر ئەرزی.

وەستا ڕەحیم خەریک بوو بە ئیشتیا ئەرزەکەی دەنەخشاند و هاوکات بە شێنەیی وردەکارییەکانی باس دەکرد،کە لەپڕرا خاڵعەباس کوتی:

- وەستا کوتت ئەوە کوێ بوو؟ ئەوەی ئەو قولینچکەی؟

وەستا وەک ئەوەی بە زۆری ملت سوڕاندبێ، ئاوڕێکی لە شوێنی ئاماژەکراوی خاڵعەباس داوە و زۆر بە بێمنەتی کوتی:

- ئەوە چێشتخانەیە.

- مدبەق؟

- نا چێشتخانە.

- هەر هەوە ئیدی! ئەدی بۆ لەوێیە؟

وەستا کە دیتی ئەو وڵامە کورتە بەشی خاڵعەباس ناکا و پێویستە زیاتری بۆ شیکاتەوە، دەستی لە گێچەکە دەرهێنا و ڕووی لە خاڵعەباس کرد.

- ئەدی لە کوێ بێ باشە؟

- بۆم لە حەسارێ دابنێ.

بە بیستنی ئەو قسەیە نەک هەر وەستا ڕەحیم، بەڵکوو هەموو ئامادەبووان چاویان بڕییە خاڵعەباس.

- کاکە چێشتخانە چۆن لە حەساریّ دەبیّ! خۆ ئەوە جێی تەندووری نییە جێی قاپوکەچکانە.

- چێشتخانە چۆن لە ژووریّ دەبیّ! ئەوە سبحەینیّ چوار میوان لەو ژوورەی دانیشتن، دەنگی قاپوکەچکان هات، لێم بە ئیراد ناگرن. ناڵێن سەگباب خێرییە، دەسەڵاتی ژنومنداڵەکەی نییە.

بابم کە لەبن سێبەریّ راوەستابوو و خەریک بوو دووکەڵی بەبا دەکرد زۆر بە تێڕادیوی کوتی:

- کوڕە وەستا بەقسەی مەکە. خانووەکەی سەقەت دەبیّ.

بەڵام، خاڵعەباس زۆر لەسەر قسەی خۆی پێداگر بوو و بە سوێندی تایبەتی خۆی کە لەئەگەری هەر شتێکی پێچەوانە حەڵاڵی دنیایەی لە خۆی حەرام دەکرد، هەڕەشەی کرد لە ڕوودانی هەر پارچەکردارێک کە بە دڵی وی نەبیّ. بەو شێوەیە، چێشتخانە هاتە حەساریّ و دەرفەتی هەرجۆرە نارەزایەتی دەربڕینێک لە ئامادەبووان گیرا.

بە دڵنیاییەوە ئەوپەڕی چاوەڕوانی وەستا ڕەحیم بۆ داواکاری سەیروسەمەرە هەر ئەوەندە بوو و کاتێک دواتر ئاستی جیاوازی بیرکردنەوەی خاڵعەباسی دیت سەری‌سوڕما.

- وەستا ئاودەستەکەی گەورە بیّ. پیاو جارجار شتی لیّ‌دادەنیّ.

وەستا وێدەچوو لە کاردانەوەی سەیرتری بترسێ هەربۆیە بە پارێزەوە کوتی:

- کاک عەباس زەمینەکەت زۆرە، دەڵێی عەمبارێکت بۆ لەو سەری سازکەم.

خاڵعەباس کە خەریک بوو وەستای ڕام دەکرد و بە دڵی خۆی هەڵیدەسوڕاند، بە شێوەیەکی متمانەبەخۆ کوتی:

- خەرجی زیادی لێ ناکەم، هەر ئاودەستەکەی زەلام سازکە تەواوە.

وەستا یەکدووی لێ نەکرد و هەموو فەرمایشەکانی خاڵعەباسی تەواو بردە بواری جێبەجێکردن. نەخشە کێشرا، بناغەتێکرا، دیوار هەڵاچوون و کار گەیشتە دارەڕایە. لێرەدا بوو کە یەکەم نیشانەکانی دژایەتێکی قورسی ناوخۆیی، لە ماڵی خاڵعەباس ئاشکرا بوون.

لەوەتی کوڕ گەیبوونێ و کاسبیان دەکرد، خاڵعەباس دەسەڵاتەکەی لە کزی دابوو. سەرچاوەی دارایی وەک گرینگترین کارتی فشار لەدەستی چوو بووە دەرێ. تەنیا ئامرازی بەردەستی کە تا ڕادەیەک دەیتوانی کاریگەر بێ، زیرە و زمانەشڕەکەی بوون.

خانووســازکردن مەیــدانێکی گرینــگ بــوو تــاکوو خاڵعەبــاس، ڕادەی کــاریگەری تەنیــا ئــامرازی بەردەســتی لە قۆنــاغی نوێــدا، تاقی بکاتەوە. هەرچی خاڵعەباس بوو دەیکوت:

- حەڵاڵــی دنیــایەم لــێ حەرام بــێ، ئاســنی دەخــانووی هەڵناکێشــم. نــۆرەی ئەوەیە بەســەرمدا بڕووخــێ. ئەوانە تەمــاحی میراتــی گرتــوونی، دەیــان هەوێ بمکــووژن. دەنــا ئەتــۆ ئەگە خــانووت دەوێ، ئاسن دەڵێ چی و دار دەڵێ چی.

هەتــا شــەڕی قســان بــا، بەدڵنیــاییێوە کەس بــۆی نەبــوو ســەنگەر بە خاڵعەباســی چۆلکــا. بەڵام تواناکــانی خاڵعەبــاس لە شــەڕی نەرمــدا هێشــتا بە چــاکی تــاقینەکرابوونەوە. بنەمــاڵەکەی بە هەســتپێکردنی ئەو کەلێــنە تــاقینەکراوە، زۆر نــاجوامێرانە بە شــەڕی نەرم ڕووبەڕووی بــوونەوە و بــۆ مــاوەیەکی ڕانەگەیێنــدراو لێــی لالــووت بــوون. مانیــان گــرت و خۆیــان لە هەمــوو هاوکاریکردنێکی بوارد.

خاڵعەبــاس وەک ئەوەی لەپێشــدا خــۆی ئامــادەی هەمــوو ئەگەرێــک کردبــێ، بە شــێوەیەکی گاڵتەئــامێز باســی ڕاوبۆچــوون و بەرنامەی خۆی، بۆ دایکم دەکرد:

- ئیــدی وەدەزانــن ئەگە دمیــان لێهەڵمووســاندم، ئەوە ... پێــدەچێ. کچــێ بە مەرقەدی شــێخی ســبحەینێ دەچــمە

مەلیکەنـــدی خاوەرێـــک داران دێـــنم. پێتـــوایە ئەلحـــان ئەمـــن جوابی ئەو دمسەگەی دەدەمەوە.

بـۆ مـن مەلیکەنـدی پرسـیار بـوو کە دەبـێ کـوێ بـێ، بـۆ دایکـم کـاردانەوەی شـیاو بە ئەو قسـەی خاڵعەباسـی. لە ئاکامـدا ئەو ڕۆژە هیچمان بە وڵامی پرسیاری خۆمان نەگەیشتین.

بـۆ سـبحەینەکەی تـازە لە قوتابخـانە هـاتبووینەوە و خەریکـی خـواردنی جەمـی نیـوەرۆ بـووین کە خاڵعەبـاس بە بـێ هـیچ ئاگادارکردنەوەیەک، سەری بە ژووری داگرت:

- خەجێ کوڕەکانم بۆ بنێرە دەرێ، داران دادەبەزێنم.

بەو پێـیەی کە لە مانـای دابەزانـدن دڵنیـا بـووین، بە پەلەپەل نانمـان خـوارد و چـووینە دەرێ بـۆ سـەر زەوی خاڵعەباسـی کە هێنـدێک لەسـەرتر بـوو. هەتـا نیوەشـەو، یـارمەتێکی چاکمـان کـرد و لەو ڕۆژەڕا تێگەیشـتین کە دار دابەزانـدن یـانی ئەوەیـکە دەبـێ پاکیشـیان کەیـن. بەشـداری ئـێمە وەک خوشـکەزا هەر لێـرە کۆتـایی نەهـات و هەتـا دوا قۆنـاغ بە شـێوەیەکی بەردەوام بەشـداریمان هەبـوو. هەرچەنـد بنەمـاڵەی خاڵعەبـاس دواتـرکە لە کـاریگەر نەبـوونی مانگرتنەکەیـان دڵنیـا بـوون، وردە وردە بە هیـوای هێنـدێک ڕیفـۆڕم. مانگرتنەکەیـان شـکاند، بەڵام وەک دەرکەوت، زۆرترین کـــاریگەری مـــانگرتنی بنەمـــاڵەی خاڵعەباس، لەسەر ئێمە بوو.

هەروا کە خـــانوو دانـــانی قۆنـــاغ بە قۆنـــاغ، بەپێـــی نەخشـــەڕێگای خـــۆی دەچـــووە پێشـــێ، ترســـی بنەمـــاڵەی ئـــێمەش لە قۆنـــاغی گڵەبـــان زیـــاتر دەبـــوو. هەمـــوو سەداســـەد دڵنیـــا بـــووین کە خاڵعەبـاس دنیـاش خەرابـێ، بـۆ کـارێکی ئـاوا، کرێکـار نـاگرێ و وەک نۆکەری خۆڕایی، بە ئێمەی دەکا.

ڕۆژی هەینـــــی دیـــــاریکراو، وەک ڕۆژی پشـــــووی قوتابخـــــانە، پـــێمەڕە بە دەســـت، چـــاوەڕێی ئەمـــری خاڵعەبـــاس بـــووین، تـــاوەکوو گڵەبـــان دەســـت پێـــبکەین، کەچـــی خاڵعەبـــاس دیـــار نەبـــوو. لە ئەنجـــامی پرســـیار و وڵام دەرکەوت کە خاڵعەبـــاس بە دوای لـــــۆدێری شـــــارەوانیدا ڕۆیشـــــتووە کە دوور لە چـــــاوی بەرپرســـــان، بیهێنـــێ و بە نیســـکە پووڵێـــک، کـــاری ســـێ ڕۆژی ئێمەی پێ بکات.

بەهـۆی خۆشـحاڵی ڕزگـار بـوون لەو بێگـارییە بـێ یـا هەر شـتێکی تـر ئەو کـاتە بـۆ یەکەمجـار هەسـتم بە بـوونی هێنـدێک زرینگـی لە نـــاخی خاڵعەباســـدا کـــرد، ئەگەرچـــی دواتـــر زۆر بە تونـــدی پاشگەز بوومەوە.

پـــاش تاوێـــک ڕامـــان و چـــاوەڕوانی بە نەڕەی لـــۆدێر وەخـــۆ هـاتینەوە و بـۆ دیتنـی لـۆدێر و خاڵعەبـاس لەسـەر پـێ چەقـین. لەوکـــاتەدا تەنیـــا شـــتێک کە بە جـــۆرێکی جیـــاواز وەبەر چـــاو دەهـــات، خاڵعەبـــاس بـــوو کە بە نیـــوە بـــزەیەک لە تەنیشـــت

شــۆفیرەکە دانیشــتبوو. هەســتی ڕاســتەقینەی خاڵعەبــاس نــازانم، بەڵام بە مەزەنــدەی مــن، هەســتی ســەددامی هەبــوو، کاتێــک لەســەر تانــک دانیشــتبوو و بە نێــو ئــاپۆڕەی ســەربازاندا تێــپەڕ دەبوو.

دەگەڵ گەیشــتنیان بــۆ شــوێنی مەبەســت، خاڵعەبــاس گورجێــک خــۆی فڕێــدا خــوارێ. وەک ئاغــای ســەر خەرمــان دەســتی دەبەر کەلەکەی نــا و خەریکــی وردە ئەمــران بــوو. لەبەر نەڕەی لــۆدێر، دەنــگ نەدەگەیشــتە دەنگــی، هەر بــۆیە خاڵعەبــاس لەوکــاتەدا بە کەڵـــک وەرگـــرتن لە زمـــانی ئامـــاژە، خەریکـــی دەربڕینـــی بیرۆکەکــانی خــۆی لە بــواری ئەنــدازیاری بــۆ شــۆفیرەکە بــوو. شـــــۆفیریش کە بە دڵنیـــاییەوە خەریکـــی کەڵـــک وەرگرتنـــی بێمــۆڵەت لە کەرەســەی حکــوومی بــوو، خێراخێــرا ســەری بــۆ دەلەقاند.

کە لــۆدێرەکە یەکەم کەچــکە گڵــی بــردە ســەرێ، دڵنیــا بــووم ڕۆژێــک بێگــاریم لەکــۆڵ بــۆتەوە. کەچــکەی دووهەم، هیــوای زۆرتــری پێبەخشــیم. دەگەڵ کەچــکەی ســێهەمی لە ســەر بــانی ڕۆکــرد، بەوی دیــتم، سەداســەد دڵنیــا بــووم دەبــێ دوو حەوتــووی دیـــــکە، بێگـــــاری خاڵعەباســـــی بـــــکەم. دارەڕای کۆشـــــکە خنجــیلانەکەی خاڵعەباســی بەرگەی قورســایی گڵەبــانی لــۆدێری نەگــرت و دارمــا. نە تەنیــا دارەڕای تێکقرمانــد، بەڵکــوو لایەکــی دیواریشــی دەگەڵ خــۆی بــرد. لە مــاوەی چەنــد خولەکــدا، هەمــوو

هیـــوای حەســـانەوە لەو خـــانووبەرە و هەســـتی مـــن بەدیتـــنەوەی زرینگی لە ناخی خالّعەباسیدا, لە بیر چوونەوە.

هێشـــتا تەپوتـــۆزی ئەو دارڕمـــانە نەنیشـــتبۆوە کە زیـــرە و هـــاواری ژن و منـــدالّ بەرزبـــۆوە. ئەگەرچـــی ئەو دارڕمـــانە بە خۆشـــحالّیەوە هـــیچ زەرەری گیـــانی بەدووە نەبـــوو، بەلاّم کـــۆلّەکەی ئـــابووری خالّعەباســـی تێکشـــکاند و چـــاوڕوان دەکـــرا تووشـــی قەیرانێکـــی سەختی بکا.

پـــاش نیشـــتنەوەی تەپوتـــۆز و هـــاواری خـــانوو ڕۆ و کـــاکە ڕۆ، جەمـــاوەر کەوتـــنە ســـەرکۆنەی ســـەرەکیترین بەرپرســـیاری ئەو خەســـارە گەورەیە. دیـــارە بەهەر کەلێنێکـــدا لێـــت ڕوانیبـــا، تەنیـــا دەســـتی خەتابـــاری خالّعەبـــاس تێیـــدا دیـــار بـــوو. ئەنـــدامانی بنەمـــالّە وەک ئەوەی بەرپرســـیارێتی لـــۆمەکردنی خالّعەباســـیان لە نێـــوانی خۆیـــان دابەش کردبـــێ، هەریەکەو لە هێلّێکـــڕا هێرشـــی بـــۆ دێنـــا. ســـێ لە ســـەرەکیترین هێلّەکـــانی هێـــرش بریتـــی بـــوون لە: چێشـــتخانەی لە حەســـار، ســـەربانی دارەڕاکـــراو و لـــۆدێر بـــۆ گلّەبـــان. هەر لەو بەیـــانییە هەتـــا مالّنوســـتنان، لە نێـــو گەرمەی هـــاتوچۆی میوانـــان کە بـــۆ دلّخۆشـــی دانەوە دەهـــاتن، ئەو هێرشـــانە لە ســـێ قـــۆلّەوە بەردەوام بـــوون. بە درێژایـــی ئەو مـــاوەیە، خالّعەبـــاس وەک بەرگـــرییەک، تەنیـــا ئامـــاژەی بـــۆ مـــقەدەری خـــودای دەکـــرد و بەو پاســـاوە، خـــۆی لەهەر جـــۆرە بەرپرسیارەتییەک دەدزیۆە.

- ئەوە مـــقەدەری خـــودایە خـــودا. پـــێش بە مـــقەدەری خـــودای ناگیرێ.

دیتنـــی ئەو بـــارودۆخە نالەبـــارە، هەســـتی هاوســـۆزی میوانـــانی بـــزاوت. هەر ئەو شـــەوە بڕیـــاردرا بـــۆ ســـبەی هەرەوەزێـــک ســـازکەن و کـــارەکەی بـــۆ ڕێکـــخەن. لە ئەنجـــامی هەرەوەز و دەســـتەواوی خـــزم و دراوســـێ، بە دوو ڕۆژ خـــانوو خـــاوێن کـــراوە. دیوار سەرلەنوێ هەڵاچوونەوە و گەیشتەوە قۆناغی دارەڕایە.

بەڕای مـــن ئەو ســـاتە ســـەختترین ســـاتی ژیـــانی خاڵعەبـــاس بـــوو، چـــوونکە بە هـــیچ جۆرێـــک نەیـــدەوێرا باســـی داران بکـــاتەوە. کاتێـــک کـــوڕە گەورەکەی ڕۆیـــی بـــۆ ئاســـن کـــڕین بە چـــاوێکی پـــڕ حەســـرەتەوە لێـــی دەڕوانـــی. لەوانەیە لەهەمـــوو ژیانیـــدا وەهـــا بارودۆخێک نەهاتبێتە گۆڕێ کە نەوێرێ قسەی خۆی بکا.

دیتنـــی ئاســـن بە ســـەربانێوە ئەگەرچـــی بـــۆ خاڵعەبـــاس زۆر نـــاخۆش بـــوو، بەڵام نەیـــدەوێرا هـــیچ بژاردەیەکـــی دیـــکەی هەبـــێ. هەر لە ســـاتی دارمـــانەکەوە، ئیختیـــاری بردنەپێشـــی پڕۆســـەکە، لەدەســـت خاڵعەباســـی هـــاتە دەرێ، بەجۆرێـــک دەکـــرێ بکـــوترێ ئەوەی مـــانگرتن پێـــی نەکـــرا، دارمـــان کـــردی. تەنیـــا ڕۆڵـــی بەرچـــــاوی خاڵعەبـــــاس لەو ســـــاتەوە دە ئەو پڕۆســـــەیەدا، ڕەخنەگرتنـــی بەردەوامـــی بە شـــێوەی خـــۆی بـــوو کە زۆرجـــار زیـــاتر لە بـــۆڵە دەچـــوو. وەک هەڵســـەنگاندنێک دەکـــرێ بکـــوترێ، ئەو

دارمـــانە دوو ئەنجـــامی ناڕاســـتەوخۆی هەبـــوو: لاوازکردنـــی یەکجـاری پـێگەی خاڵعەبـاس لە بـواری بڕیـاردان و ڕزگـاری یەکجاری ئێمەی خوشکەزا، لە هەر جۆرە بێگارییەک.

خاڵعەبـــاس لە هەرجـــۆرە بڕیاردانێـــک ســـەبارەت بە شـــێوەی سـازکردنی خـانووەکەی دوورکـراوە و کـوڕ لغـاوی کاریـان گـرتە دەســـت، بەڵام کـــارە شـــازەکەی خاڵعەبـــاس وای گیرفـــان هەڵتەکانـــدن کە هەر ئەوەنـــدەیان بـــۆکرا کـــاری ژووری تەواو بـکەن و حەسـاریان بـۆ سـاز نەکـرا. ئاسـانترین کارێـک کە لە وەهـا بارودۆخێکـدا دەکـرێ، بـۆ ئەوەی هەسـت بە ئاسـوودەیی بـــکەی ئەوەیە کە تاوانبارێـــک بـــدۆزیەوە و هەمـــوو قورســـایی ناخۆشـی نەبـوونەکەت، بـخەیە ئەسـتۆی. هەرچەنـدە خاڵعەبـاس تاوانبـاری سـەرەکی بـوو، بەڵام دیـاریکردنی وەک بەرپرسـیاری هەتاهەتـایی، تۆزێـک نـاجوامێرانە بـوو. خاڵعەبـاس، دواتـر وەک لە قسـەکردنیرا دیـار بـوو، گرفتـی دەگەڵ بەرپرسـیار ناسـینی خـۆی نەبـوو و وازی لە مەقەدەر هێنـابوو، هەربـۆیەش کاتێـک گلەوگازنـدەی نەبـوونی پـوولی بـۆ سـازکردنی حەسـار لێـدەکرا، هەموو جارێ خۆی لە ئەسڵی پرسەکە دەدزیەوە و دەیکوت:

- حەسـارم بـۆ چیـیە. کـێ کـاری بە مـاڵە مـنە. هەرچـی بردیـان گەردنیان ئازاد بێ.

حاشا لێکردن لە پرسەکە نەدەبووە هۆی ئەوەی گرفتەکانی بشاریتەوە. تەنیا هاتنی زستان و هاتوچۆی ژن و منداڵ بۆ چێشتخانەی هەڵکەوتوو لە دەرێ بوو کە دەیتوانی مەنتقی خاڵعەباس لەخەو هەستێنێ. بەڵام لەخەو هەستانیشی لەو کاتەدا هیچ سوودی نەبوو. تەنیا پارە بوو کە دەیتوانی چارەی هێندێک لەو گرفتانە بکاتەوە و ڕەنگ و ڕوویەک بە خانووەکەی کە زۆرتر لە کەمپی ئاواران دەچوو، ببەخشێ.

هۆی حەسار سازنەکردنی خاڵعەباس لە سەرەتادا پوول نەبوون بوو، بەڵام بۆ ساڵی دواتری کە پوول هەبوو نەیدەویست وا بە ئاسانی لە قسەی خۆی پاشگەز بێتەوە. وێدەچوو لە هۆکارێک بگەڕێ تاوەکوو بەبێ ڕاکێشانی سرنجی جەماوەر، بە ئەسپایی پاشەکشە بکات. هەڵبەت پێویست نەبوو هۆکارەکە ڕاستی بێ، چونکە ئەگەر نەشبا، خاڵعەباس دەیتوانی، بە هۆکارێکی ڕاست، دەستنیشانی بکا.

تا ئەو جێیەی ئەمن ئەوکات ئاگاداری ژیانی خاڵعەباس بووم، خاڵعەباس دوو جووتی کەوش زیاتر نەبوو. جووتێک کەوشی جیر کە پێیان دەکوت وێن و جگە لە کاتی کارکردن بۆ نویژی هەینیش دەبەری دەکردن، چونکە دەیکوت کەوشی دیکەم لێدەدزن. جووتێکیش کەوشی مەجلیسی هەبوون کە هەرکاتێک خۆی لەگوڵێ دەدا، بۆیاغی دەکردن و دەپێی

دەکــرد. جــگە لەو جــووتە کەوشــە، بەش بە حــاڵی خــۆم هــیچم نەدیتبوو، ئیدی نازانم ئەو شانۆیەی بۆ کام کەوشی بوو.

- کـورە بـابم پیـاو نـاوێری تاوێـک چـاوی خافـڵ بکـا ئەگە شـتێکی لێـدەدزرێ. ئـاخر کـوا ئـاوا دەبـێ. دنیـا بـۆتە هەرەجمەرەج. گـای بە کولانەیدا هەڵدەکێشن.

ئەو هاتوهـــــاوارەی خاڵعەبـــــاس ئەو ڕۆژە، دەوری کەڵەبـــــابی نـــاوەختی لە کـــۆڵانی ئـــێمەدا گێـــڕا و بـــووە هـــۆی کۆبـــوونەوەی جەمـــاوەرێکی بەرچـــاو. کاتێـــک ئامـــادەبووان پرســـیاری هـــۆی هاتوهاوارەکەیـــان لێکـــرد، وەک کـــابرایەکی زوڵـــم لێکـــراو، ئەوپەڕی خەفەتی خۆی ئاوا بۆ لینگە کەوشێک دەربڕی:

- چ بـــووەی چـــی بـــابم! مەمـــلەکەت کەس‌بەکەســـە. نـــاوێری تاوێــک لە شــتەکەت خافــڵ بــی. دوێنــێم کەوش کڕیــوە، هێشــتا لاقم تێهەڵنەکێشابوو، بردوویانە.

لەو کــاتەدا تەنیــا شــتێک کە خاڵعەبــاس پێویســتی پێنەبــوو ئەو ڕســتانە بــوون کە بــاس لە گرینــگ نەبــوونی کارەســاتەکە دەکەن. چــونکە خاڵعەبــاس بەڕاســتی پێویســتی بە بیــانوویەک هەبــوو تــا لە قســەی خــۆ لەبــابەت حەســار ســازنەکردن پاشــگەز بێــتەوە. هەر بـــۆیە لە کـــاردانەوە بەو ڕســـتەیەی کە کـــوترا هـــیچ نیـــیە خاڵعەباس، کەوشێک چییە بەڵاوەگێڕی خۆت بێ، کوتی:

- بەڵای چی و شتی چی دایکەکەم! ئەوە هاتوو کەوش نەبا ماشێن با، بە بەڵاوەگێر، زەرەر دەگەڕێتەوە؟ ئاوا کوا دەبێ! حەڵاڵی دنیایەم لێ حەرام بێ سبحەینێ حەساری خۆم سازدەکەم.

بەوجۆرە خاڵعەباس بەبێ کەمترین کاردانەوەی لاوەکی، لە قسەی خۆی پاشگەز بۆوە و بڕیاری سازکردنی حەساریدا. هەڵبەت بە فەرموودەی قەدیمییان گا بە کولانەیدا هەڵکێشان، یارمەتی خاوەن ماڵیشی دەوێ، هەربۆیە لەو بابەتەدا، وەک گومانێک پێشبینی جێ پەنجەی خاڵعەباس دەکرا. ئەگەرچی کەس بۆ سەرەداوێک نەگەڕا.

خاڵعەباس پێش ئەوەی هەرجۆرە باسوخواسێک بێتە گۆڕێ، دەستی کرد بە ئامادەکاری و هەر ئەو ئێوارەیە بە تاقیتەنێ ملی لە خەندەق هەڵقەندن نا. ئەو پێداگری و هەوڵە بەپەلەی خاڵعەباس، ئەگەری پەیدابوونی هەرجۆرە بیرۆکەیەک بۆ هێنانە ژێرپرسیاری ڕووداوەکەی بە یەکجاری پەکخست.

ئەوجارە، بۆسازکردنی دیوار، بە پاساوی ئەوەیکە وەستا ڕەحیم، دەستی سووکنییە، ئەگەری بانگهێشتکردنەوەی لەئارادا نەبوو و خاڵعەباس وەستا باقی تازەلاوی وەک جێگرەوەیەک دەستنیشان کرد. خاڵعەباس وەستا باقی زۆر بەدڵ بوو و دەیکوت وەستای چاکە، زۆر بە گوێیە، هەرچەند

دواتــر بە چــاکی نێــو نەدەهێنــا و دەیکــوت خێــرییە. هۆیەکەشــی بە پێی فەرموودەی خاڵعەباسی ئەوە بوو کە:

- ئەو هەتیوە خێرییە منداڵی بۆ ژنەکەی هەڵدەگرێ.

ئەودەمەی وەســتا بــاقی، وەســتای خاڵعەباســی بــوو، هێشــتا ئەو تایبەتمەنــدییەی بــۆ خاڵعەباســی ئاشــکرا نەببــوو و خاڵعەبــاس بە دڵـــی خـــۆی هەڵیدەســـوڕاند و پێیهەڵادەکـــوت. شـــازترین هەڵاکوتنەکانیشـــــی بەراوردکردنـــــی بە وەســـــتا ڕەحـــــیم و هەڵکێشانی وەستا باقی بوو.

- جــا وەســتا نەچــی وەک ئەو ناوەســتایەم دەگەڵ بــکەی، زووم بــۆ تەواو بــکە. ماشــەڵڵا دەســتوبردی چاکــت هەیە، دەبەردەســتت مرم ئەورۆ نەجاتم بدە.

وەســـتا بـــاقی تۆزێـــک شـــەرمێون بـــوو. خاڵعەبـــاس هێنـــدەی بەشـــانوپیلیدا هەڵاکوتبـــوو زۆریـــش لە وەختـــی خـــۆی لایـــدەدا، پێـی عەیـب بـوو دەسـتهەڵگرێ بە تـایبەت کە کرێکـاری خۆشـی دەگەڵ نەبـــوو و هەمـــوو دەســـتوپێوەندی خاڵعەباســـی بـــوون. وەســـتا بـــاقی وا بەدەســـت خاڵعەباســـەوە گیریخواردبـــوو کە خوداخــودای بــوو نەجــاتی بــێ، هەربــۆیە خــۆی لەدژایەتیکردنــی داخوازێکـــانی خاڵعەبـــاس دەبـــوارد. بەڵام کە کـــار گەیشـــتە دەروازەی حەسارێ، خۆی بۆ نەگیرا و شتێکی هەرکوت.

- وەستا گیان دەبەردەستت مرم دەروازەکەی گەورە سازبکە.

- خاڵەگیان چاکم داناوە. هەموو جۆرە ماشێنێکی تێوەدەچێ.

خاڵعەبـــاس هاوکـــات کە خەریـــک بـــوو بە ئامـــاژەی دەســـت و شەقاو دەروازەی دیاری دەکرد کوتی:

- چـــاک کـــوا ئـــاوایە؟ دەروازە، تراکتـــۆری بە تلێـــرەوە تێـــوەنەچێ بۆ دەروازەیە! گەورەتری بکە کاکە.

ئەوە یەکەمـــین و دواهەمـــین ڕادەربڕینـــی وەســـتا بـــاقی لەو دوو ڕۆژە کـــارەی دابـــوو، ئەگەرچـــی خاڵعەبـــاس دەربـــڕینەکەی ڕەتکـردەوە. وەسـتا بـاقی بە پێـی داواکـاری خاڵعەباسـی خەریکـی خۆشـــکردنی شـــوێنی تێپەڕبـــوونی تراکتـــۆر بە تلێـــرەوە بـــوو کە خاڵعەبـاس غەیـب بـوو و تـاوێکی پێچـوو هەتـا بە هـاوڕێیەتی وەستای دەرکەوپەنجەران گەڕاوە.

- وەســتا گیــان بــۆ ئێــرەم دەوێ. ئەمــان شــتێکی لەبــارم بــۆ ســاز بکە.

وەســـتای دەرکەوپەنـــجەران کە لەبەر ڕەشـــایی و چەوری ئاســـن لەســـەر دەموچـــاوی، تەنیـــا ســـپیایی ددان و چـــاوی دیـــار بـــوو، یەکسەر سیودوو ددانەکەی وەدەرخست و بە گاڵتەوە کوتی:

- ئەرێ وەستا! ئەو لادیوارەت لەبیر نەچووە؟

وەســـتا بـــاقی دەرفەتـــی ئەوەی پەیـــدا نەکـــرد بەرگـــری لە وەستایەتی خۆی بکا چونکە خاڵعەباس هەڵیدایە:

- لادیواری چی وەستا، دەروازە ئەوەندە هەردەبێ ببێ.

وەســـتای دەرکەوپەنـــجەران بە هەســـتێکی دڵســـۆزانەوە کە بە زەحـــمەت لە پشـــت ڕەشـــایی ســـەر دەموچـــاوی ئاســـەواری بەدی دەکرا، کوتی:

- جـا خـۆ خـاڵە ئـاوا، بەقەد خەرجـی هەمـوو دیـوارەکەت، پـووڵی دەرکەت دەچێ.

خاڵعەبـــاس بە بیســـتنی ئەو قســـەیە دەموچـــاوی وەک قیلـــی لاسوانان داچۆڕاو و بە دەنگێکی نزم کوتی:

- بەڕاستیتە وەستا؟ هێندەم دەچێ؟

و بەبـــێ ئەوەی چـــاوەڕوانی وڵامـــی وەســـتا بکـــات، ڕوویکـــردە وەستاباقی و کوتی:

- وەسـتا ئەمـن سـەهوو بـووم، کـوڕە بـا تلێـر نەبـێ هەر جیبێکـی تێوەچێ کیفایەتە.

هەڵـبەت ئەوکـات هـیچ بـاس لە جیـب کڕینـی خاڵعەبـاس نەبـوو و ئەوە داوایەکـــی کەســـێکی کەلـــلەڕەق بـــوو کە تەنیـــا بە جەفەنگێکـــی لەو چەشـــنە، توانـــای دەربڕینـــی پەشـــیمانی خـــۆی هەبوو.

نێو هێنانی جیب ئەگەرچی لەپڕڕا بوو بەڵام تەواو بێهۆش نەبوو. ئەوکاتە باو، باوی جیب گالانت بوو. ئەو جیبانەی وەک بەرماوی هەشت ساڵ شەر، لە لایەن حکوومەتەوە دەفرۆشران و بۆ ماوەیەکی زۆر، بۆ بەرگری لە زیادبوونی حەشیمەت، کاریگەری لە حەبی دژە زگپڕبوون زیاتر بوو. بەهۆی هەرزان بوونیان بە زۆر کەس دەکڕدران و بۆ مەبەستی قاچاغی کەڵکیان لێوەردەگیرا. تەنیا کاریگەری بەرچاوی ئەو جیبانە ئەوە بوو کە بۆ ماوەی چەند ساڵ، کۆڕەوی کوورەخانانی وەستاند و هەلی کارێکی پڕمەترسی بۆ لاوانی چینی هەژار ڕەخساند. ئەگەرچی ئەو کاریگەرییە، کاریگەری تری بە دووی خۆیدا هێنا و لە درێژماوەدا کلتوورێکی تایبەت بەو چینە تایبەتە سازکرد کە خۆی لە شێوە قسەکردنی جیاواز، جلوبەرگی جیاواز و مۆسیقای جیاوازدا دەدیتەوە.

ئەوکات ئەو ڕووداوە پێشبینی نەدەکرا، بەڵام خاڵعەباس نەخوازراو، جێی بۆ ڕمبازێنی گالانت لە دەرکی خۆیان خۆش کرد. پێویست بوو ئەو زستانە بووکێکی دیکە دابەزێنێ هەتا قەرزوقۆڵەی شایی، گوشارێکی وەها سەختی لەسەر سازبکا کە مل بە کڕینی ئەو داشەهارەیە بدا.

ئەو هەموو قەرزەی لەسەر خاڵعەباس کەڵەکە ببوو، هیچ ڕێیەکی دیکەی بۆ نەهێشتەوە جگە لەوەیکە، تەنیا یادگاری

بـــاب و بـــاپیرانی، یـــانی پەڵە زەوی بەربەرۆچـــکەی ئاســـمانێ بفرۆشـــێ و تەهـــای ئـــازیزی، وەک یەکێـــک لە سێســـوچکەی وەجاغی خۆی، گالآنت سوار بکا.

هەواڵـــــی ئەو گۆڕانکـــــارییە گەورەیە، زۆر درەنـــــگ بە ئـــــێمە گەیشـــت و بەجارێـــک ســـورپڕایزی کـــردین. بە تـــایبەت ئەو ڕۆژەی کە خاڵعەباســـمان دیـــت بە زارێکـــی پـــڕ پێکەنـــین، لە پێشـی گـالآنتەکەی دانیشـتووە و کاتێـک بەدەرکـی ئـێمەدا تێـپەڕ دەبـــوون، ئەو دەســـتەی کە هەمیشـــە لەســـەر لێـــواری دەرکەکە دادەنا، گەزێک هێنا دەرێ و سڵاوی لێکردین.

ڕۆژەکـــانی هەوەڵـــێ، تەواو مـــاڵی ئـــێمەی لەبیـــر چووبـــۆوە و بە ســـەختی ســـەرقاڵی گالآنتەکەیـــان بـــوو. پێوەنـــدی خاڵعەبـــاس و گالآنتەکەیـــان، ســـرنجڕاکێش بـــوو. ســـەندەڵی پێشـــێ بەدڵنیـــاییەوە تـــایبەت بە خاڵعەبـــاس بـــوو و بە هـــیچ جۆرێـــک قەبـــووڵکراو نەبـوو لە حـزووری جەنابیانـدا کەسـێکی تـر لەسـەری دابنیشـێ. وەک عادەتێــک دەبــا هەمیشـــە دەســـتی ڕاســـتی لەســـەر لێـــواری پەنــــجەرەکە دانابــــا و ئانیشــــکی لە دەرێ بــــا ئەگەرچــــی کەشوهەوا یـارمەتی نەدابـا، چـونکە ئەگەر وانەبـا بەڕاسـتی لێـی دەبوو بە بەڵا و نەیدەزانی چی لێ بکا.

زۆر جـــار ئاماژەکـــانی هـــۆگری خاڵعەباســـم بەو ئـــامرازە دەهـــاتە بەرچـاو. ئەو کاتـانەی جغـارە بەدەسـت بە دەوروپیلیـدا دەهـات.

جارناجارێـــک پێیەکـــی دە تەگەران دەکوتـــا و وەک شـــارەزایەک لێیان خورِ دەبۆوە.

وەک منـــداڵێک کە شـــتێکی تـــازەی بـــۆ کرِدرابـــێ، دڵـــی نەدەهـــات بەجێـــی بێڵـــێ. هەرکـــات گاڵانـــت هەڵکرابـــا، بە دڵنیـــاییێوە خاڵعەباسیشـــی تێـــدابوو. ئەو شـــێوەی خاڵعەبـــاس هـــاورِێیەتی گـــاڵانتی دەکـــرد، لـــێکەوتەی چـــاکی نەبـــوو. لە ســـەرەتادا کە شـــــۆفیریان بـــــۆ گرتبـــــوو هەتـــــاکوو تەهـــــای فێربکـــــا، ئەو پێوەنووســـــانەی خاڵعەباســـــی بە ســـــەندەڵی پێشـــــێ، گرفتـــــی گەورەی ســـازکردبوو. تەهـــا دەبـــا لە پشـــتەوەرِا فێـــری لێخـــورِین بووبـــا. دواتـــر کە تەهـــا تەســـدیقی وەرگـــرت و هـــاتە پێشـــێ، خاڵعەباس هەر لە جێی خۆی مایەوە.

ئێـوارەی خاڵعەباسـاویم نەدیـتەوە هەتـا ئەوکـاتەی تەهـا بـوو بە شـۆفیر و دەسـتیان بە قاچـاغی کـرد. ئەو شـانازییە هاوکـات بـوو دەگەڵ عـــــادەتکردنی خاڵعەبـــــاس بە گاڵانـــــت و جارجـــــار دابەزینی.

ئەوە بەخێرهێنـانەکەی دایکـم، لەبەر دەرکـی حەسـارێ بـوو کە مزگێنی وەرزێکی نوێی دیداری خاڵعەباسی پێدراین.

- کاکە ئەوە بۆ دیار نی؟ لێمان ناپرسی! یارِەبی بە خێرێی...

لە وڵامـــی چاکوخۆشـــییەکەیرِا دیـــار بـــوو کە دەبـــێ ئاســـتی چاوەرِوانیمان لە گفتولفتی خاڵعەباسی، بەرینە سەرێ.

- ئەریٚ چــۆنی خوشــکیٚ؟ هەر خەبەرت نیــیە! لەو بســتەڕێیەی حاڵێکی کاکت ناپرسی...

هەمــوو پیــاوێکی ســەداقەت، دان بەوە دادەنــیٚ کە وادیــارە کــاریگەری گاڵانــت لەســەر دەروونــی خاڵعەبــاس، یەکجــار زۆر بــووە کە لە (خــودات لــیٚ ڕازی بــیٚ)ڕا هــاتۆتە ســەر ئەو چاکوخۆشــی پڕهەســتە. هەڵــبەت خاڵعەبــاس هەر بەوەنــدە نەوەستا و لەو هەست و سۆزەی بەشی ئێمەشی دا.

ئەو ڕۆژە بــابم وەک ئاگــای لە ئەجێنــدای قســەکانی خاڵعەبــاس بــیٚ، پــاش ئەوەی کە بە لالێــوی بەخێرهــاتنی کــرد دەنگــی تەلەویزیــۆنەکەی بەرز کــردەوە و ســرنجی خســتە ســەر شاشەکەی.

خاڵعەبــاس کە هێشــتا دایکمــی بە فریــا نەگەیشــتبوو هەتــا بە پرســیارێک ســەری قســەی بــۆ دامەزرێنــیٚ، بە ئەوپەڕی سەرســوڕمانەوە هەواڵــی دەرس و قوتابخــانەی لە مــن پرســی. ئەمــن کە بەو ئــۆینە تــازەی خاڵعەبــاس، حەبەســابووم، بە کــورتە وڵامێک، ئاسایی بوونی بارودۆخی قوتابخانەم پیٚڕاگەیاند.

دوابەدوای ڕوونــوێنی لەو ســوڕپرایزە، دایکیشــم خــۆی گەیانــدیٚ و لە گەرمەی چاکوخۆشــــیدا ئەوەنــــدەی لە زاری دەرپەڕی کوتی:

- ئەریٚ کاکە دەگەڵ ماشێنەکەتان چۆنن؟

ئەو هەڵە ستراتیژیکە کە بە باوەڕی بابم، لە لایەن خوشک و برا، پیلاندارێژراو بووە، بواری بۆ خاڵعەباس ڕەخساند تا هەوڵەکانی بۆ چەوساندنەوەی بابم بخاتە گەڕ.

- جا خوشکێ لە چی دەپرسی! هەر دەبێ بڵێی لە خودای بەزیاد بێ. خودا بە نەسیبی هەموو کەسی کا. نیعمەتە نیعمەت!

ئەگەرچی بابم بە ڕواڵەت، خۆی لەو قسانە بێ گوێ کردبوو، بەڵام وەک لە قسەکانی لە پاش ڕۆیشتنی خاڵعەباسیڕا دیار بوو، تەواو کەوتبووە ژێر کاریگەری و سەداسەد پێی وابوو، ڕووی ئەو قسانە دەگەڵ ئەوییە.

خاڵعەباس بابەتێکی مۆری دەستکەوتبوو و بە ئیشتیای خۆی لە حەوشی تاریفان جیفرکی لێدەدا.

- ئەگەر ئاوام دەزانی، وەڵڵا دە ساڵ پێش دەمکرێ. وەبزانە شەش کوڕ کاسبیت بۆ دەکەن....

هەروا کە خەریک بوو، چاوەڕێی ئەوەی نەکرد کەس سەری سوڕ بمێنێ یا هۆگری خۆی بۆ باسەکە بدرکێنێ و یەکسەر چووە سەر وردەکارییەکان.

- خودا پشتیوان بێ ئەو مانگەی نا ئەوی دیکە، یەکی دیکەش دەکرم. دەیدەم بە شۆفیری بۆم بگێڕێ. شوکور لێی

پەیــدا دەبــێ. لە خــودای بەزیــاد بــێ هەمــوو ڕۆژێ دەگەڵ بــانگی نیوەڕۆیە، دەهەزارم دە گیرفانی دایە.

دایکم وەک ناوبڕێک هەڵیدایە:

- کاکە ماشەڵڵایەکی بڵێ. چاوەزار پیسە! بۆی هەیە!

خاڵعەبــاس وەک ئەوەی هەســتی بە مەترســی کردبــێ، تۆزێــک ڕاما بەڵام دواتر چووە سەر باسی تواناکانی گاڵانت.

- ماشــێن هەر گاڵانــت! خــۆ نەدەزانــی هەوراز چیــیە، بەرد چیــیە، ئاو چییە. هەر دەڕوا. شتەکە ئەگە ژاپۆن بوو، ئاوایە!

خاڵعەبــاس بەو ڕێــڕەو گــۆڕینە، چــووە ســەر بــابەتی دڵخــوازی مـــــن. ئەمـــــیش وەک بەشـــــدارێکی چـــــووک، ویســـــتم پەرە بە باســەکە بــدەم و بیــبەمە ســەر بەراورد کردنــی ماشــێنەکان، هەر بۆیە لە زارم دەرپەڕی و کوتم:

- خاڵە ماشێنی چاکت نەدیوە، دەنا گاڵانت بۆ ماشێنە!

بە بیســتنی ئەو قســەیە، بــابم کە تــا ئەو کــاتە چــاوی لەســەر شاشــەی تەلەویزیــۆنەکە هەڵنەگرتبــوو، نیگــایەکی پــڕ لە ســپاس و پێزانینـــــی لێکـــــردم. بەڵام هەر بە خێرایـــــی خۆشـــــی نیگـــــای ئەمەگناســانەی بــابم، کەوتە بــن ســێبەری ڕەشــی چــاولەژێڵڵا هـــاتنی خاڵعەباســـی. وەک ئەوەی بـــۆ دیتـــنەوەی ڕســـتەی

پێویست، خەریکی بنکۆڵ کردنی خانەکانی مێشکی بێ، چەند چرکەیەک تێم ڕاما و لە ئەنجامدا کوتی:

- هەرچی دەڵێ گالانت ماشێن نییە، کوڕی دایکوبابی خۆی نییە. ڕۆڵە ئەتۆ چووزانی ماشێن چییە....

کاردانەوەکەی ئەوەندە چاوەڕواننەکراو بوو کە هەموو ئامادەبووانی تووشی حەبەسان کرد و بۆ ماوەیەک کەشەکەی تووشی چەقبەستوویی کرد. ئەوە ڕمبازێنی دەمولێوی بوو کە لە ئاکامدا دایکمی ئاگادار کردەوە کە پێویستە بەپەلە ناوبڕێک بخاتە نێو باسەکەوە. هەر بۆیە بە وردبینی ژنانەوە خاڵێکی وا هەستیاری دیتەوە کە شەڕی گالانتی نەک لە بیری خاڵعەباسی بەڵکوو لە بیری ئێمەش بردەوە.

- حەک ڕەبی مبارەک بێ. ئەدی کاکە ئەوە بۆ ناڵەی ئەو ساعەتە جوانەت کڕیوە. دادەی وەڵلا جوانە! ئەوە دژە ئاویشە؟

ئەو کارە تەنیا لەدەست ژنێک دێ کە بتوانێ سەروبنی کەسێک هەر بە نیگایەک، بپشکنێ، تەواوی وردکارییەکانی بە مێشکی بسپێرێ و لە کاتی خۆیدا، بیخاتە خزمەت ئاشتەوایی و پتەوکردنی بناغەی خزمایەتی.

لە ئەنجامی ئەو ناوبڕەی دایکم، خاڵعەباس وەک ئەوەی لەبیری چووبێتەوە باسی چی دەکرد، چاوێکی لە ساعەتەکەی

کـــرد و چاوێـــک لە دایکـــم. هاوکـــات کە خەریـــک بـــوو ئەو مەودایەی بە هـــۆی هەڵچـــوونەکەی، لە پشـــتییەکەی پەیـــدای کردبوو، پڕی دەکردەوە، بە دەنگێکی نزم و بێهەست کوتی:

- ئەوە؟ ئەوە سێچوار ڕۆژ دەبێ کڕیومە.

لە سـەیری دنیـایە خاڵعەبـاس شـتێکی تـازەی کڕیـوە و نەهـاتووە نمایشی بکا!

- وەڵـــڵا جـــوانە! زۆریشـــت پێـــداوە، دیـــارە! جـــا کـــاکە ئەو هەمـــوویەت بـــۆ پێـــدەدا؟ خـــودا نەخواســـتە ئەدی ئەگە لێیـــان دزی؟

دایکـــم زۆر بە زرینگـــی پرســـیاری کـــرد و هەر بۆخۆشـــی وڵامـــی داوە. بەوجـــۆرە دەرفەتـــی ئەوەی بە خاڵعەباســـیدا کە ئەهـــوەن بێـــتەوە و خـــۆی ئامـــادەی ناســـاندنی ئەو بەرهەمە نـــوێیە بکـــات. خاڵعەباسـیش بەو کـات کـڕینەوەی دایکـم خـۆی تەیـار کـرد و هاوکـــات کە بە قـــامکی گەورە و شـــادەی، جەغـــزی دەوری ساعەتەکەی دەسڕێوە کوتی:

- ئەوە ئـــۆرییێنتی حەســـڵە. لە دنیـــایە نێوبـــانگی هەیە. بـــاتری و قورمیش و شتی ناوێ، هەر بە تینی دەستی کار دەکا....

بەو تاریفـــاتەی خاڵعەبـــاس کـــردی، بە تـــایبەت گەرمـــای لەشـــەکەی، بە ئـــاوات بـــووم چـــاوێکم بەو ســـاعەتە بـــکەوێ، بەڵام

بە هـۆی ئەوەیـکە هێشـتا ئاسـەواری قەڵسـی لەسـەر دەموچـاوی خاڵعەباس تروسکەی دەدا، نەموێرا تخوونی بم.

لە درێـــژەی ئەو ئێوارەکـوڕەدا، دایکــم بە زیرەکییەکـــی بـــێوێنە، ڕێـــڕەوی باســـەکانی زووزوو دەگـــۆڕی و ڕێگـــر بـــوو لە ئەگەری هەرجـــۆرە تێکهەڵچـــوونێکی زیـــاتر. ئەگەرچـــی خاڵعەبـــاس چەنـدین جـاری دیـکە هەوڵیـدا بچێـتەوە سـەر باسـی گاڵانـت، بەڵام بە هــۆی ئەوەیــکە کەشــەکە بــۆ ورووژانــدنی ســەرلەنوێی ئەو باســە لەبـار نەبـوو، بـۆینەکرا لە ئامـاژەیەکی کـورتەوە زیـاتر، بچێـــتەوە ســـەر باســـەکە. بەو جـــۆرە یەکەم ســـەردانیکردنی خاڵعەبـــاس لە پـــاش گاڵانـــت کـــڕینەکەی کۆتـــایی پێهـــات و تێیـدا، نە خاڵعەبـاس تـوانی پـڕ بە دڵـی خـۆی لە سـەر گاڵانـت بـــدوێ و نە مـــن شـــانازی دیتنـــی ئەو ســـاعەتە نـــاوازەیەم بە نەسیب بوو.

هەمــوو لایەک دڵنیــا بــووین کە خاڵعەبــاس بــۆ تەواو کردنـــی زنجیـــرەی تاریفـــاتەکەی دێـــتەوە بەڵام زنجیـــرەیەک ڕووداوی لە ناکـــاو پەکـــی کـــارەکەی خســـت و پـــاش مـــاوەیەک کە گەورەی کردینەوە، یەزید ئاواتی بۆ نێوچاوانی دەخوازت.

تەنیــا دوو ڕۆژ پــاش ئەو چــاوپێکەوتنە پــڕ ســورپڕایزە بــوو کە یەکەم قەیرانـــی وەرزی نـــوێی ژیـــانی خاڵعەبـــاس دەســـتیپێکرد. قەیرانێــک کە دەســپێکی زنجیــرەیەک قەیرانــی تــر بــوو کە هەر

هەموویــان لەبــن ســەری گــاڵانتەکەی دابــوون. مەترســییەکانی قاچــاغی وەک بەشــێکی دانەبــڕاوی ئەو کــارە ســەلمێندرابوون و کەم کەس گلەیــی لە پێشــهاتەکان دەکــرد. خاڵعەباســیش تــا ئەو کــاتەی بــۆ خــۆی بەشــداری ئەو ڕەوتە بــوو پێشــهاتە ناخۆشەکانیشــی بە دڵێکــی فــراوان وەردەگــرت و هــاوخەمی تەهــای دەکــرد. هەر بــۆیە هەر کــات پرســیاری چــۆنیەتی ســێ ســەرمەقولاتی گاڵانتیــان لێــدەکرد, بەبــێ ئەوەی گومــانی لە دەســتوفەرمانی تەهــای هەبــێ، وەک پێشکێشــکارێکی چــاک بەدەســــتی هەڵپێچــــراوەوە، تەواوی وردەکارییەکــــانی ئەو ڕووداوەی نمــــایش دەکــــردەوە و گــــاڵانتەکەی وەک تــــاقە بەرپرسیاری ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە دیاری دەکرد.

- بە سـەری تـۆ زۆر چـاک دەهـات! گەیشـتە پـێچەکەی، بـۆ ئەو لایەی بــاداوە، ماشــێنەکە بەقســەی کــرد، بــۆ ئەولای بــاداوە بە قســەی کــرد، بەڵام هەرکە شــلی کــردەوە، جــوابی نەداوە و یەکسەر دە خڕێی هاویشت.

یەکەم قەیرانــی وەرزی نــوێی ژیــانی خاڵعەبــاس، هاوســۆزی خــزم و کەسـی بـزاوت، هەر بـۆیە هاوکـات کە خەریـک بـوو ئەو ڕووداوەی بە درێژایــــی ڕۆژ بە چەنــــد وردە جیــــاوازێوە بــــۆ ســەردانیکەرانی یەک لە دوای یەک دەگێــڕاوە، بانگاوازێــک کــرا بــۆ ئەوەی بە هانــای گــاڵانتەکەی خاڵعەباســەوە بچــن کە هێشــتا

خەریــــک بــــوو لە لاخرێـــــک، ســــەراوبن، باوبــــاوێنی دەگەڵ ساتەلایتەکانی ژاپۆن دەکرد.

لە ئەنجـــــامی ئەو بــــانگەوازە بەرفــــراوانە و بە پێــــی دابــــی کــوردەواری لەکــاتی لێقەومــان، جەمــاوەرێکی بەرچــاو خۆیــان تەیــار کــرد و چــوونە شــوێنی مەبەســت. هــیچ ئــامراز و کەرەســـەیەک پێویســت نەبــوو. جەمــاوەرەکە ئەوەنــدە زۆر بــوو کە هەر بەشــێکی کەمیــان خەریکــی هەڵکێشــانی گاڵانــت بە دەســت بــوون و ئەوانــی دیــکە لە دوورڕا قەوەتیــان دەدایە. چەنــد خــولەکی زیــاتر نەخایانــد کە بەبــێ ئامــادەبوونی خــاوەن مــاڵ، قریـــوەی خۆشـــی بەرز کـــرایەوە. گـــاڵانتەکەی خاڵعەباســـی بە ســەروگوێ شــکاوی، هــاتەوە ســەر تەگەر. دەســبەجێ دەپاشــی ماشێنێکی دیکە خرا و گەیشتەوە دەرکیماڵی خاڵعەباس.

بــــۆ ســــبحەینێ ئێــــوارەکەی کە خاڵعەبــــاس لە بەڕێکردنــــی سەردانیکەران ببـۆوە، دەسـت بە مـل هەڵواسـراو هـاتە بەر دەرگـا و چــاوی بە گاڵانــت کەوت. ڕوخســاری هیچــی نەدەدرکانــد. وەک ڕۆژان دەورێکـــی بە دەوری گاڵانتـــدا لیـــدا بەڵام هـــیچ پێیەکــی دە تەگەران نەکوتــا و تەنیــا بــۆ مــاوەیەک ســەیری ســـەروگوێی تێکقرمـــاوی کـــرد. ئەو شـــەوەش لە کەشـــێکی ماتەمــاوی ســەرقاڵی میــوان بەڕێکــردن بــوو. هێــدی بــوونەکەی بەردەوام بــوو هەتــا ڕۆژی دواتــر کە بە دیــداری وەســتایان شــاد بــوو و هەواڵــی خەرج و مەخــاریجی لــێ پرســین. لەو کــاتەدا بــوو

کە پۆست مۆدێرنی سووک کرد و سەرسوڕهێنەرترین تازەگەرییەکانی لە بواری جنێودانـدا، بە بە ئامانج گرتنی سیلەندر و ئێگزۆز ڕوونویێنی کرد.

بە درێژایی ڕۆژێک ئەگەری هەموو ئەگەرێکی خستە ڕوو. هەر لە وەدرنانی تەهارا بگرە هەتا سەڵت بوونی خۆی بەسەری پیری. لە کاتی هێنانە بەرباسی هەموو ئەو ئەگەرانە پێویست بە بوونی هیچ شایەدحاڵێک بۆ پشتڕاستکردنەوەیان نەبوو، چونکە بەرزی دەنگی خاڵعەباس لە هەموو بەڵگەیەک بێمنەت بوو و بە درێژایی سەد میتر لە چواردەوری ماڵە ئەوان، هەموو کەس دەیتوانی پشتڕاستی هێنانە بەرباسی ئەو ئەگەرانە بکات.

هەموو ئەو هاتوهاواره تەنیا نارەزایەتی دەربڕینی کەسێکی بێ دەسەڵات بوو کە دەیویست بێزاری خۆی، بە یاریکردن بە دوایین کارتەکانی بەردەستی پێشان بدات. لە ئاکامدا نە تەها وەدەرێندرا و نە بۆخۆی سەڵت مایەوە بەڵام ئەو ڕووداوە جرجی یەکجاری خستە نێوان هاوکاری بازەرگانی ئەو باب و کوڕە، بە جۆرێک تەها لاقی چەقاند و خۆی لە هەر جۆرە هاوڕێیەتی خاڵعەباسی بوارد. بیانووشی بۆ ئەو هاوکاری نەکردنەی جگە لەو نێوان ناخۆشییەی دوایی، زۆر بوو و چەندین کردەوەی سەیروسەمەرەی خاڵعەباسی، وەک هۆکار دەهێناوە کە تەنیا پشتڕاستکردنەوەیان لەلایەن خاڵعەباسەوە

بـــــوو کە ئەو دەرفەتەی بە گـــــوێگر دەدا کە بتـــــوانێ ئەگەری ئەوجۆرە بیرکردنەوە لە مێشکی کەسێکدا باوەڕ بکا.

ئەوەیـکە تـۆ بـاری قاچـاغ بێنـی و هاوکـات قەڵسـەی لە هێزەکـانی ئاسـایش بگێـڕی، تەنیـا بە خاڵعەبـاس دەکـرێ. بەڵام ئەو پرسـە بە بەراورد بە پـــــرۆژە گەورەکەی خاڵعەباســـــی، تەنیـــــا جەفەنگێک بوو.

- شـەرت بـێ کەڵاشـێکی بکـرم. جـا چـۆن عەجەم پـێش بە مـن دەگرێ!

هەرچەنـــد ئەو بیـــرۆکەیەی خاڵعەباســـی، دەرفەتـــی ئەوەی بـــۆ نەڕەخســـا بچێـــتە بـــواری جێبەجێکـــردنەوە، بەڵام هەر ئەو چەنـــد پـارچە کـردارەی پێشـانیدا، تەهـای ناچـار کـرد لە ژێـر فشـاری هاوڕێیـــانی، خـــۆ لە هاوکـــاریکردنی خاڵعەباســـی بپـــارێزێ. مـــاوەیەک کەشـــەکە هەروا بە چەقبەســـتوویی مـــایەوە و هـــیچ کامیـــان حـــازر نەبـــوو لە هەڵوێســـتی خـــۆی پاشـــگەز بێـــتەوە. لە ئاکامـــدا بە بەڕێـــوانی هێنـــدێک خـــزموکەس، خاڵعەبـــاس ڕازی کـرا کە خانەنشـین بـێ و ئێوارەوئێـوارە پـووڵی خـۆی وەرگـرێ، دە تەنکەی گیرفانی بنێ.

لەســـەرەتادا خاڵعەبـــاس بە بێمەیلـــی ملـــی بەو ڕێگاچـــارەیەدا، بەڵام دواتـــر کە ببـــوو بە حـــازر خـــۆری بـــن ســـێبەرێ، دووبـــارە کەیفـــی ســـازبۆوە و جەزمەی گاڵانـــت، گرتێـــوە. لەو مـــاوەیەدا

لەبەر بێکــــاری، زۆر بەســــەری دەکـــردینەوە و مێشـــکی بــــابمی هەڵدەپشاوت.

کەیــــف ســــاز بــــوونی خاڵعەباســــی، هاوکــــات بــــوو دەگەڵ گوشـــارێکی زۆر لە ســــەر تەهــــای. ئەو کە دەبــــا هەمــــوو ڕۆژێ بەشــی هەرە زۆری داهــاتەکەی وەک مــووچەی خانەنشــینی، بــدا بە خاڵعەباســــی، دەرەقەتــــی خەرجــــی ماشــــێنی نەدەهــــات و نەشــیدەوێرا داوا لە خاڵعەباســی بکــا. هەربــۆیە ئەو گوشــارە وای لێکــرد ڕێگــای پڕمەترســیتر بگــرێتەبەر و دەســت بە قاچــاغی شلّقەی بکا.

مــاوەیەک لە ژێــر ســێبەری بــێخەبەری خاڵعەباســدا، تەهــا بە پــــــوولّی شــــــلّقەی کەیفــــــی دەکــــــرد و ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژێ تەیــارتردەبوو. کەڵاشــی بەســەر پێــوە دەکــردن و قســەی شــەش پووت شەشپووت دەکردن.

تەنیــا کەســێک کە لەو مــاوەیەدا زۆرتــرین گوشــاری دەروونــی لەســــەر بــــوو، بــــابم بــــوو کە هەمــــوو ڕۆژێ دەبــــوایە گــــوێی لە خۆهەڵکێشـــــاندنەکانی خاڵعەبــــــاس بووبــــــایە. ئەوکــــــات کە خاڵعەبــاس بەشــێک بــوو لە کەرەســەی پەیوەســتی گاڵانــت، زۆرمــــان نەدەدیــــت، بەڵام لەوەتــــی خانەنشــــین ببــــوو، هەمــــوو ئێــواران بە دیــداری شــاد دەبــووین و گوێمــان بــۆ فەرمایشــەکانی ڕادەگـــرت. بە هەر قســـەیەک دەســـتی پێکردبـــا لە ئاکامــــدا،

سـەرەبان و بنەبـان دەهـاتەوە سـەر تەنـکەی گیرفـانی کە لە سایەسـەری گـالانتی، هەمـوو ڕۆژێ دەهەزاری تێـدایە. بـابم زۆری دانبەخـۆدادەگرت، بەڵام تەواو کەسـادی پێـوە دیـار بـوو. هـیچ دەسـتی بـۆ نەدەکـراوە. تەنـانەت دایکیشـیم هەسـتی بەو لاسـەنگی هێـزە کردبـوو و وەک جـاران بە خاڵعەباسـی هەڵانەدەکوت.

بـابم بە پـێچەوانەی ئەوەی لێـی چاوەڕوانـدەکرا، بە متمـانەیەکی لەڕادەبەدەر بەو ڕسـتەیە کە دنیـا دەوران دەورانە، زۆر ژیـرانە مـامەڵەی دەگەڵ ئەو بـارودۆخە دەکـرد. هەسـتیارانە چـاوەڕێی دەرفەتێکـی دەکـرد، بـۆ ئەوەی لە ژێـر ئەو گوشـارە قورسـە دەربـاز ببـێ، هەر بـۆیە هەمـوو هەواڵێکـی پەیوەسـت بە خاڵعەبـاس و بنەمـاڵەکەی، بە وردی شـرۆڤە دەکـرد و لە هـۆ و هۆکاری دەپرسیێوە.

لە ئاکامـدا خـۆری بەختـی بابیشـم هەڵات. ئەو کـاتەی کەسـێک، بە هەر هـۆیەک، لە کـن بـابم کوتبـووی، تەهـای خاڵعەباسـی، خەریکـی ویسـکییە. لەسـەرەتادا بـابم وەک بۆخـۆی دەیکـوت بـۆی پرسـیار بـوو ویسـکی چیـیە، پێشـی عەیـب بـوو بپرسـێ، هەر بـۆیە وەک ئەوەی بـاو بـوو، بەرپەرچـی قسـەی کـابرای دابـۆوە و هەر جـۆرە ئەگەرێکـی لەوجـۆرەی ڕەتکردبـۆوە. دواتـر کە لەملا وئەولا بە پرسـیار مەبەسـتی کـابرای تێگەیشـتبوو و ئەگەری باسـەکەی پشتڕاسـتکردبۆوە، بە هەگبەیەکـی پـڕ ڕووی دە مـاڵێ

کــــردەوە. دەگەڵ یەکەم درکانـــدنی، زۆر ژیـــرانە ڕێـــی هەمـــوو بەرگرییەکـــی لە دایکـــم برێـــوە و لە پاشـــان تەواو متمـــانەبەخۆ ئامادەی چاوپێکەوتنی ئەو ئێوارەیەی خاڵعەباس بوو.

بە ئاســـــانی لە هەڵســــوکەوتی بـــــابمرا بەدی دەکـــــرا کە ئەو ئێـــوارەیە بـــۆ وی، زۆر چارەنووســـازە، بە جۆرێـــک کە لە خەوی پـــاش نیوەڕۆشـــی خۆشـــبوو و تەنیـــا بە چەنـــدجار ئەودیواودیـــو کـــردن، کۆتـــایی پێهێنـــا. دایکیشـــم دامـــاو لە گۆشـــەیەک دەســـتی خســـتبوو ســـەر دەســـتی و لـــووتی داژەنیبـــوو. بە پـــێچەوانەی ئەوەی گومـــانم دەکـــرد کە دایکـــم خاڵعەباســـی لە هـــاتنی ئەو ئێـــوارەیە پاشـــگەز دەکـــاتەوە، هـــیچ ئەگەرێکـــی لەو جـــۆرە لە ئـــارادا نە بـــوو و باســـەکە ئەوەنـــدە گرینـــگ بـــوو کە ئەویـــش بێمەیـــل نەبـــوو کە هەرچـــی زووتـــرە، چـــارە بکـــرێ. لە ئـــاپۆڕەی بێـــدەنگێکی بەســـام، بـــۆ یەکەم جـــار، هەمـــوو چـــاوەڕێی خاڵعەبـــاس بـــووین. هەریەکەمـــان لە سووچێکەوە تامەزرۆی ئەو باسە بووین.

خاڵعەبـــاس وەک ڕۆژان، هەرکە تاوبـــان کـــز بـــوو، بە لارەلار پەیـــدا بـــوو. دەگەڵ جێخۆشـــکردنی، بـــابم وەک پێویســـتییەک بـــۆ کـــردنەوەی ســـەری قســـان، بەپـــێچەوانەی هەمـــوو ڕۆژان، زۆر گەرموگـــوڕ بەخێرهـــاتنی کـــرد و هەواڵـــی وڵاتـــی لـــێ پرســـی. هەواڵـــی تەهـــای لـــێ پرســـی. هەواڵـــی قاچـــاغی لـــێ پرســـی. خاڵعەبـــاس لە شـــێوەی وڵامـــدانەوەکانیرا دیـــار بـــوو کە هێشـــتا هەســـتی بە هـــیچ جیـــاوازییەک نەکـــردووە و تەنـــانەت لەوەی کە بەبـــێ هەوڵـــی

خـۆی باسـەکە دەچێـتە سـەر قاچـاغی زۆریـش کەیفـی سـاز بـوو و خەریـک بـوو نـوتقی دەکـردەوە کەچـی بـابم خـۆی نەگـرت و هێشتا خاڵعەباس لە وڵامە سەرەتاییەکان نەببۆوە کە کوتی:

- کاک عەباس شتێکی بڵێم پێت ناخۆش نابێ؟

خاڵعەبـاس بە کەمێـک گومـانەوە ئامـادەی وڵامـدانەوە دەبـوو کە بابم دەرفەتی پێنەدا و کوتی:

- کـاک عەبـاس، کـوڕی تـۆش هەر کـوڕی خـۆمە. بە قەبرێکـی بـابم چـۆتێ، تەهاشـم بە قەت ئەو دوو کـوڕەم خـۆش دەوێ. بە ئیخۆمی دەزانم بۆیە باس دەکەم، دەنا بەمن چی.

ئەو شـێوە هاوسـۆزی نـامۆیەی بـابم، خاڵعەباسـی نەختێـک هەسـتیار کـرد و بـۆ بیسـتنی شـتێکی گرینـگ دەسـتی لە هەڵبەستنی تووتن و پەڕەکەی هەڵگرت.

- کاکعەبـاس خەڵـک چـی چـاک نـاڵێ. ئەو فـێعلانە بـۆ، بـۆ کوڕی تۆ دەبێ. کێ تا ئێستا شتێکی خەراپی بە ئێوەوە دیوە.

خاڵعەبـاس وا پرسـیارکەرانە دەیـڕوانییە بـابم کە هۆشـی نەبـوو هێشـتا تـووتنی دە پەڕەکەی نەکردبـوو کەچـی بە زمـانی تەڕی دەکرد.

- کوڕی تۆ بۆ، بۆ ئەوەی دەبێ، ئارەقی بفرۆشێ.

خاڵعەبـــاس بە بیســـتنی ئەو قســـەیە وەک دڕووی دە ســـمتی ڕۆچووبێ، ڕمبێک بڵیند بوو و بە تەواوی هێزەوە نەڕاندی:

- ئەوە کێ ئەوەی دەڵێ هەتا گۆڕی بابی وا لێبکەم؟

بـابم بە هـیچ جۆرێـک خـۆی بـۆ وەهـا کـاردانەوەیەک ئامـادە نەکردبـوو و پێـی وابـوو خاڵعەبـاس گومـان لە ڕاسـتی هەواڵەکە ناکـات، کەچـی نەتەنیـا بە ڕسـتەیەک، قسـەکەی ڕەتکـردەوە بەڵکوو هێرشی پێچەوانەشی کرد.

تەنیـا شـتێک کە بـابم وەک بەرگـری غەریـزی بـۆی کـرا، خـۆ دزیـنەوە بـوو لە ئەگەری تـێکەڵ بـوون بەو کێـیەی خاڵعەبـاس ئـاوا بە زەبـر هەڕەشـەی لێکـرد، هەر بـۆیە گورجێـک خـۆی خزانـدە سـەنگەری خاڵعەبـاس و شـێوازی قسـەکردنەکەی گۆڕی.

- کاکعەبـاس هەتـا شـتەکە ڕاسـت یـا درۆ بـڵاو نەبـۆتەوە بـا چـارەی بکەیـن. قسـە زۆر هەڵدەبەسـترێن بـا نەهێڵـین بـڵاو بێتەوە.

بەڵام خاڵعەبـاس بەو ئاسـانییە ملـی بە کەمتـرین ئەگەری ئەو دەنگـۆیەش نەدەدا و بە لاتـاوێکی جەرگبـڕ، پێـداگری لەسـەر ڕاستنەبوونی ئەو قسەیە کرد.

- نەوەڵــڵا ئەو خەڵــکە حەســوودن. چاویــان بەو ماشــێنەی ئــێمە هەڵنــایە. کــوڕی مــن ســەری بچــێ نــوێژی نــاچێ، چــۆن شــتی وا دەکا.

لغــاوی باســەکە لە دەســت بــابم دەرچووبــوو. ئەو کە مەبەســتی ســەرکۆنە کردنــی خاڵعەبــاس بــوو ئێســتا بەرەوڕووی بوختانێــک ببــۆوە. هەر قوونەجــووڵەی بــوو باســەکە بگــرێتەوە دەســت، بەڵام بە پشـــــتیوانی ئەو ڕەتکـــــردنەوە تونـــــدوتۆڵەی خاڵعەباســـــی دایکیشــم وەخــۆ هــاتەوە و بــۆ پشــتیوانی کــاکی وەخــۆکەوت. هەر هێنــدەی پێنەچــوو کە ڕەتکــردنەوە، بــۆ هێرشــکردن گــۆڕدرا و تیژایــی پەلامارەکەیــان خســتە ســەر بــابم. بــابم هیــوا بــڕاو خەریکــی پەلەقــاژە بــوو و زۆر بە کەســادی بەرپەرچــی دەدانەوە تــا لە ئاکامــدا هیچــی پــێ نەمــا و بە شــێوەی خاڵعەباســی قســەی یەکلاکەرەوەی خۆی کرد.

- ئــاخر هەرســێک تەڵاقــم کەوێ ڕاســت وایە، ئیــدی بــۆ مــل نــادەن. ئەگە ڕاســت دەکەن بــۆ نــاچن لە شــتەکەی بکــۆڵنەوە دوایە وە درۆم خەنەوە.

ئەو ســوێندەی کە لە ئەدەبیــاتی زارەکــی بابمــدا شــتێکی نــامۆ بــوو، ئەگەرچــی مۆڕبــوونەوەی تونــدی دایکمــی لــێکەوتەوە، بەڵام وردە گومــانێکی خســتە بەرەی دژبەرەوە و تــا ڕادەیەکــی زۆر سســتی کــردن. بــۆ چەنــد خــولەکێکی تــر خاڵعەبــاس بە مینگەمینــگ،

بێهیـــوا، خەریکـــی چەنگەکـــڕکە بـــوو هەتـــا کەشـــەکە پـــێچەوانە کـــاتەوە، بەڵام هاوپەیمـــانەکەی چیتـــر هۆشـــی لەســـەر باســـەکە نەمـــابوو و بەدوای هەڵگیرســـاندنی شـــەڕێکی ســـاردی درێژخـــایەن بـــوو. لە ئاکامـــدا لە کەشـــێکی ســـارد و پـــڕ لە مڕەمـــڕ، خاڵعەبـــاس ڕۆیشت.

ئەوە تەنیـــا ســـەرەتایەک بـــوو و هـــیچ کەس شـــکی دەوەیـــدا نەبـــوو کە خاڵعەبـــاس، هەتـــا لایەکـــدا نەخـــا، دەســـتبەرداری ئەو باســـە نـــابێ. ئەو، کەســـێک نەبـــوو کـــاتی خـــۆی بە بەڵـــگە دۆزیـــنەوە خەســـار بکـــا. خاڵعەبـــاس یەکســـەر دەچـــووە ســـەر گومـــــانلێکراو و داوای دانپێـــــدانانی لێـــــدەکرد. بە پـــــێچەوانەی هەمـــوو دادگـــایەک کە ئەو کەســـەی ئیـــدعایەکی هەیە دەبـــێ بەڵـــگە بێنێـــتەوە، لە بەردەم دادگـــای خاڵعەبـــاس تۆمەتبـــار بە بـــێ ئەوەی هـــیچ بەڵـــگەیەک دژی هەبـــێ دەبـــێ بێتـــاوانی خـــۆی بسەلمێنێ.

زۆر جیـــاوازتر لەوەی گومانمـــان لێـــدەکرد، خاڵعەبـــاس هەر ئەو ئێـــوارەیە دەگەڵ بیســـتنی ئەو باسوخواســـە، تەهـــای وەک تاوانبـــار ئەژمـــار کردبـــوو. لەســـەرەتای شـــەو هەتـــا درەنگانێـــک، دانیشـــتنی دادگـــایی کردنـــی تەهـــای بەردەوام بـــوو. تەنیـــا دادگـــایی نەبـــوو بەڵکـــوو هاوکـــات دانپێـــدانانی زۆرەملـــی و هێرشـــی تاوناتـــاویش هەبـــــوو. هەمـــــوو ئەو قۆنـــــاغە یەک لە دوای یەکـــــانەی دادگـــــاییکردنەکەی بە بـــــێ ئامـــــادەبوونی هـــــیچ کەســـــێکیتر

بەرێوەچـــوون و بەهـــۆی تایبەتمەنـــدی جیـــاوازی وتـــوویژی خاڵعەبـــاس، لە مەودای دووریشـــڕا لێکـــدەکرانەوە. ئەوە تەنیـــا درەنـــگ بـــوونی شـــەو و بێتـــاقەت بـــوونی خاڵعەبـــاس بـــوو کە توانی کۆتایی بەو شەڕە بێنێ.

یەکەم کـاردانەوەی ئەو شـەوە لالـووت بـوونی تەهـا لە هەمـوو ئەنـدامانی بنەمـاڵەی ئـێمە بـوو. وادیـار بـوو کە بە سـەرچاوەی ئەو دەنگـۆیەی زانیـوە، بـۆیە بـۆ بەیـانی کە بە پێیـان بە کوڵانـدا دەڕۆیشتە خوارێ، هیچ سەروسڵاوی نەبوو.

ئەو هەمـــوو هاتوهـــاوارەی شـــەوی ڕابـــردوو و لالـــووت بـــوونی تەهـــا وایکـــرد دایکـــم ســـەرەڕای ترســـی لە خـــاڵۆژنم، بـــۆ بـــاسوخواس خـــۆیەک بگەیێنێتـــێ و پـــاش تاوێـــک بە نـــوێترین هەواڵەکـان بگەڕێـتەوە. وادیـار بـوو تەهـا لە ئەگەری هەر جـۆرە دەستلێدانی گاڵانـت وشیار کرابـۆوە و هەتـا هەتـایە دەبـێ بەرەڵـڵا بەرەڵـــڵا بســـووڕێتەوە. ئەوە بڕیـــاری کۆتـــایی خاڵعەبـــاس بـــوو بەڵام چاوەڕوانـــدەکرا وەک هەمـــوو بڕیارەکـــانی تـــری، هەر زوو لێـــی پاشـــگەز بێـــتەوە و چـــاوەڕوانی بیـــانوویەک بکـــات هەتـــا هەڵیوەشـێنێتەوە. بـاش یـا خەراپ، ئەوجـار ئەو پاشـگەزبوونەوەیە زۆر زووتـــر ڕوویـــدا. وەســـتانی گاڵانـــت، وەســـتانی داهـــاتی خاڵعەباسـی بەدواوە بـوو بە تـایبەت ئێسـتا کە تەواو خانەنشـین بـــوو، هەر بـــۆیە زۆر زوو ملـــی بە بەرێـــوانی دا بەو مەرجەی تەهـا چیـدی ئەو بەزمەی نەکـات. لەولاشـەوە تەهـا مەرجـی دانـا

کە بەشی خاڵعەباسی دەبێ کەمکرێتەوە. ئەو شەڕەمەرجە بۆ ماوەیەک پێشی بە هەر جۆرە پێشکەوتنێک گرت هەتا لە ئاکامدا یەکی لێزان ئاوای نسحەتی تەهای کرد:

- کوڕە ئەتۆ زۆر شێتی! ئەو بەزمە چییە دەیکەی؟ دەهەزارەکەی بۆ بکە بە بیست هەزار و بڵێ کارت پێم نەبێ.

ئەو تەکبیرە ئەگەرچی چاوەڕوان دەکرا کاردانەوەی توندی خاڵعەباسی بەدووەبێ، بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە، خاڵعەباس بە بێدەنگێکی پڕ لە ڕەزایەت، ملی بەو مەرجە دا و وەک دڵسۆزێکی باوکانە، ئاوای نسحەتی تەهای دەکرد:

- ڕۆڵە خۆ ناڵێم مەیکە! دەیکەی بە حەیا و ئەدەب بیکە، با ناحەزمان پێ خۆش نەبێ.

گڵۆپە سەوزە باوکانەکەی خاڵعەباس، بۆ هەرجۆرە هەڵسوکەوتی تەهای ڕێگا خۆشکەر بوو و لەو ڕێگایەدا سنوورەکانی یەک لەدوای یەک بەزاند. وەک سروشتی ڕاستەقینەی ئەو کارە، تەهاش هیچی بە هیچ نەکرد و کاتێک گیرا جگە لە گالانت کە بە نێوی خاڵعەباسی بوو، هیچی بۆ دەرنەچوو. جگە لە جەریمەیەکی زۆر، چەندین مانگیش زیندانی کرا. بەڵام بەوجۆرەی دیار بوو لە ترسی خاڵعەباس هیچ گرفتێکی دەگەڵ زیندان نەبوو و هیوای دەخوازت درێژتر بووبایە.

ئەو ڕووداوە خاڵعەباسـی لە هەر جـۆرە شـایی پێبـوون بە وەجـاغی، بێهیـوا کـرد و بە یەکجـاری تەمـای گـرت ژیـانێکی دوو کەسـی پیـرانەی هەبـێ. ئەگەر وردەکارێـک هەبـا دەنـا لە بورسـە نـافەرمێکەی خۆیـان حـازر دەبـوو. ئەو سـەردەمەی بـێ کێشـەترین دەورانـی ژیـانی بـوو و هـیچ بـاس لە چارەنووسـە نـاحەجمینەکەی نەبـوو هەتـا ئەو ڕۆژەی ڕوحمـی بـۆ دوو کۆترەباریکە بزووت و ویستی هێلانەیان بۆ ساز بکات.

تایبەتمەنـدی هەمـوو کارەکـانی خاڵعەبـاس، جیاوازبوونەکەیـان بـوو. ئەگەرچـی هـێلانەی کۆترەبـاریکە دەکـرێ بە بـێ هـیچ کێشـەیەک، لە هەمـوو شـوێنێکی ئاسـایی دابـمەزرێ، بەو مەرجەی پشـیلە زەفەری پـێ نەبـا بەڵام لە ڕوانـگەی خاڵعەباسـەوە نە تەنیـا پشـیلە، بەڵکـوو هـیچ مـرۆڤیکیش نـابێ بتـوانێ بە شـێوەی ئاسـایی دەسـتی پێڕابگـا. ڕەچـاوکردنی ئەو سـتانداردە خاڵعەباسـی ناچـار کـرد لە بەرزتـرین شـوێنێک کە بە نێردیـوان دەسـتی دەگـاتێ، دایبمەزرێنـێ. خاڵعەباسـێکی پیـر، بـارانێکی بە لێشـاو و هەورە برووسـکەی بەهـارێ، هەمـوو کـاریگەر بـوون بـۆ ئەوەی خاڵعەبـاس لەسـەر نێردیـوانیڕا هەڵدێرێ.

وەک بیرەوەرییەکـی سـرنجڕاکێش، دەکـرێ لە داهـاتوودا بگێـڕدرێتەوە کە زەمانێـک لە وڵاتـی ئـێمە، نەخۆشـەکان تەنیـا لە فیلمەکانـدا بۆیـان هەبـوو لەسـەر تەختـی نەخۆشـخانە بمـرن

ئەگەینــــا لە دنیـــای ڕاســـتی، هەرکە لە نەخۆشـــێک بێهیـــوا دەبـــوون، یەکـــی بەرگ ســـپییان لـــێ پەیـــدا دەبـــوو و بەبـــێ ڕەچاوکردنی هیچ جۆرە ڕوحم و بەزەییەک دەیکوت:

- کاکە بیبەنەوە ناژی. لەخۆڕا خەرجی لێ مەکەن.

ئەو شـــتە ڕاســـت بـــۆ خاڵعەباســـیش قەومـــا. ئەگەرچـــی زمـــانی هەبـــوو بەڵام وەک مردوویەکـــی بەزوویـــی، نێـــودێرکرا. هـــیچ چـــارە نەبـــوو و تەنیـــا ئەگەری بەردەســـت بـــردنەوەی بـــوو و بـــردرایەوە. وەک نەخۆشـــێکی زۆر لە مـــردن نزیـــک، بە درێژایـــی ڕۆژ ئەوەی بە هەمـــوو تەمەنـــی خـــۆی، جـــارێکی دیتبـــا، ســـەردانی دەکـــرد و زۆربەی هەرەزۆریـــان پاســـاویان بـــۆ ئەو ســـەردانە یەک شـــت بوو:

- باشە لە کۆڵ خۆمی دەکەمەوە. با دوایە گلەییم لێ نەکەن.

ســـــەردانیکەر زۆر هـــــات و چـــــوون و لە ئاکامـــــدا کاتێـــــک مـــردنەکەی وە درەنگـــی کەوت، جـــگە لە خێـــزان و خزمـــی زۆر نزیکـــی. کەســـی بە دەورەیەوە نەمـــا. وەک بەرنـــامەی ڕۆژانە ئەو چەنـــد کەســـە بە دەورەی وەبـــوون و لە ئـــاپۆڕەی بێـــدەنگییەکی تەواو، چاوەڕێی مردنیان دەکرد.

ئەو بەرنـــامەیە هێنـــدەی کێشـــا هەمـــووی جـــاڕز کـــردن. بەڵام ڕۆژی مەبەســـت ئـــاخری هەرگەیشـــت و وەک ڕەوتێکـــی ئاســـایی، هەرکە هەســـتکرا لە مـــردن نزیکتـــرە، خێـــرا بانگهێشـــتی مەلا

کرا. مەلا لە تەنیشت خاڵعەباس دانیشت و خەریکی یاسین خوێندنەوە بوو کە لە ناکاو خاڵعەباس بە گرەگرێک دەپێشدا ئامادەبوانی وشیار کردەوە و لە پاشان بە دەنگێکی نزم کوتی:

- ڕۆڵە وەسیەت بێ، مردم، نەچن لێرەم بنێژن. لێرە کەس ناناسم. بمبەنەوە دێی.

بۆ چەند چرکەیەک وردە نیگا لە نێوانی ئامادەبووان ئاڵوگۆڕکرا، بەڵام لە ئاکامدا هەموو نیگاکان چوونەوە سەر مەلا و وەک داخوازێکی بێکوتن، داوای نوێنەرایەتی جەماوەریان بۆ وڵامدانەوەی خاڵعەباس لێکرد.

مەلا وەک ئەوەی لە ئەرکی نوێنەرایەتی خۆی حاڵی بووبێ، هێندێک تامی زاری خۆش کرد و کوتی:

- خاڵعەباس وا مەفرموو. قەبرستان ئاوەدانییە. ئیشاڵڵا دوای سەد ساڵی دیکە ئەگەر بەرەو پیلی مردن چووی، چ فەرق دەکا لێرە بنێژرێی یا لە شوێنێکی تر.

خاڵعەباس بۆ وڵامدانەوە، بە زەحمەت چەنەگەی کە بەهۆی بڵیندی سەرینەکەی دە سەرسینگی چەقیبۆوە، بزاوت.

- سەدساڵی دیکەی چی مەلا، پێت شێتم؟ ئەوەنی یاسینم بۆ دەخوێنی. ڕۆڵە گەردنتان ئازاد نەبێ ئەگەر بەرامبەر ماڵانم نەنێژن.

مەلا کە تەمەنێــک لە ناســینی ئەو زاتە بێــبەش ببــوو، تەمــای بــوو وڵامێکــی شــیاوی ئەو داخــوازییە بــداتەوە کەچــی دوا هەناسەکانی خاڵعەباسی، دەرفەتـی هـیچ جـۆرە دەربڕینێکـی پـێ نەدا.

بەو پێــیەی کە مــردوو نــابێ لە حــارزی بمێنێــتەوە، چەنــد کەسـێک بـۆ قەبـر هەڵقەنـدن، بەرەو ئـاوەدانی وەڕێ کەوتـین، بەڵکــوو لە زووتــرین کاتــدا وەســیەتی خاڵعەبــاس بەجــێ بگەیێنین.

دەگەڵ گەیشــتن بە شــوێنی مەبەســت، هەموومــان سەداســەد دڵنیــا بــووین کە بەجێگەیانــدنی وەسـیەتەکەی خاڵعەبـاس زۆر ئەســتەمە. بەرامــبەر مــاڵی ئــاوەدانی، لەو بەرقەدە، تەنیــا ئەسـەواری چەنـد بەردەتـراوکەی چەقیـوی لێبـوو و دیـار بـوو لەمێـژ سـاڵە هـیچ قەبرێکـی نـوێی بەخـۆیەوە نەبینیـوە. بەڵام بە ناچــاری، شــوێنێک هەڵبژێــردرا و بە قوڵینگــان بەربــووینە جەسـتەی زەوی. هێشـتا شـانوپیل بـۆ کـارێ خـۆش نەببـوون کە یەک بە جنێــودان لە ئــاوەدانی داگەڕا خــوارێ و ڕووی دەلای ئێمە کرد.

- ســەگبابینە ئەوە لە چــی دەگەڕێــن؟ بەخـودای ئەلحـان دەچـم لەدووی پاسگای. ئەوە خەریکن عەنتیکەی دەردێنن!!

زۆر بە کورتی و بە ترسەوە یەک کوتی:

- ئەوە سۆفی عەولایە. خۆ بەخودای بۆمان حاڵی نابێ، چی لێبکەین؟

بە چەند خولەک شانازی ناسینی سۆفی عەولا بوو کە زانیم خاڵعەباس لێرە دوانەی هەیە. ئەوەیان هێندێک ئاڵۆزتر. سۆفی عەولا یەکی شڕی پانتۆڵ شۆڕ. کەوا لە ڕەنگێک، پانتۆڵ لە ڕەنگێک. شاقەلێکی کەوا ڕەشەکەی کە گیرفانێکی نهێنی ئامال شینی پێوەبوو، هاتبوو دەرێ و دەگەڵ غاردانی باوەشێنی بەرگەدەی دەکرد. پشتێندێکی ڕەشی گوڵ وردی چڵکنی بەست بوو، ئەوەندە لە عۆدەی دەسرەی چڵمی هاتبوو دەرێ کە سەرەکەی وەک کلکە بزن چەقیبوو و نەدەنوشتاوە. لینگە پانتۆڵێک دەگۆرەویدا ئەوی دیکەی قوتار ببوو. کەوشە جیرەکانی ئەوەندەیان قوڕ هەڵگرتبوو، هەموو جارێ بەقەد جێ پێی فیلێک، ئەرزیان شوێن دەکرد. بەرگ و لیباسی زۆر لە دەموچاوی ڕێکوپێکتر بوو. ئەوەندەی ڕدێن هێشتبۆوە کە شوێنی بێ تووک لە سەر ڕوخساری بەدی نەدەکرا. هەر لە بن چاوی‌ڕا هەتا بنان گوێی، هەمووی هەر تووک بوو. ئەوەندە بێ ساحەب ڕوابوو، وەک تووکی بزنە مەرەز، لێکهالابوو. تەنیا سەیرکردنێکی وردی پێویست بوو هەتا ئاسەواری تڵتە چای تێدا بدۆزیەوە. ئاستی هەردووک کونەتفینکی وەک کانێ گراوان شوێنی دووکەڵی تووتن و پەڕی پێوە دیار بوو. هاوکات کە بەو سەروسیمایە بە پەلەپەل

دەهـات بە قـوڵە گۆچانەکەشـی هەڕەشـەی دەکـرد. هاوڕێیەکمـان کە دەیناســـی، وەک بەرگرییەکـــی ســــەرەتایی، پـــێش ئەوەی بمانگـــاتێ ڕســـتەیەکی ئاگـــادارکەرەوەی بە دەنگـــی بڵێنـــد گەیاندێ.

- کاک سۆفی نەیکەی ئی خۆنە!

کـاک سـۆفی بـۆ بـازدانی لە کەنـداڵێکی سـەر ڕێـی دەسـتێکی بە پـــێچوکلاوەکەی گـــرت کە بەقەد ســـێڵێک دەبـــوو و هاوکـــات دەگەڵ پەڕینەوەی، سەرێکی هەڵێنا و لێمان خوڕبۆوە.

- خۆن و مۆن کێیە؟ ئەلحان ئەو گیایەم بۆ لێ هەڵدەقەنن.

بە بیسـتنی نێـوی خـۆی دیـار بـوو کەمێـک ئەهـوەن بـۆتەوە و پرسیارەکەشی توندوتیژی جنێودانەکەی پێوە نەبوو.

- کـــاک ســـۆفی، خاڵعەبـــاس مـــردووە. وەســـیەتی کـــردووە بیهێنینەوە ئێرە.

- عەباس کێیە؟

- عەباسی مرۆتێ.

- جـا عەبـاس کەنگـێ خەڵکـی ئێـرە بـووە! سـەد ساڵە لێـرە نەمـاوە. نە زەوییەکی لێرە هەیە نە جێگیایەکی هەیە.

پـێم خـۆش بـوو بڵـێم خـۆ گـاڕانی بـۆ لەوەڕانـدنێ نـاهێنێتە ئێـرە، زەوی بـــۆ چیـــیە بەڵام بە درێـــژەی قســـەکانی بەو قەنـــاعەتەی گەیانـــدم کە ئێســـتا هەموومـــان لەســـەر هێڵێکـــی دووســـەر خاڵعەبـــاس، ئەوسەراوســـەرێ دەکەیـــن. وەدووکەوتنـــی زیـــاتر بێفایدەیە.

– وەسـیەتی چـی و شـتی چـی! ئێـرە مڵکـی مـنە. خەتـی جـووتم لێـــرە دەگەڕێـــتەوە. نـــۆرەی ئەوەیە تراکتـــۆرم لێهەڵـــدێرێ. ئـــاخر عەبـاس نیـیە! خـۆ نەبـۆتە شـێخ و مشـایخ! پەنجـا سـاڵە ئێـرە قەبرســـتان نەمـــاوە. دێـــتە ئەو بەرقەدەی دەڵـــێ چـــی. قەبرســـتانی تازە ئەوە لە دەراوێیە بیبەن لەوێ بینێژن.

ڕکـــابەری ئەو گفـــتولفتە تەنیـــا بە خاڵعەبـــاس دەکـــرا. ئەو خاڵعەباســـەی وشـــەگەلی وەک لاســـار،کەللەڕەق، سەرســـوڕهێنەر و ... بـۆ هەڵسـەنگاندنی ئاسـتی جیـاوازی ئەو، هیچیـان دەبارانـدا نەبـوو. تەنیـا وشـەیەک کە توانـای پێناسـەکردنی هەبـوو، نێـوی خـــۆی بـــوو کە دەکـــرا وەک وشـــەیەکی داتاشـــراو بە مانـــایەکی نـــوێ کە هەڵگـــری قورســـایی هەمـــوو بوارەکـــانی کەســـایەتی تایبەتی وی بێ، بە فەرهەنگەکانەوە زیاد بکرێ.

تـــاقە وەســـیەتی ئەو تاقـــانە فیلســـووفە خۆمـــاڵییە، ئەوجـــۆرەی دەیویســـت بەجـێ نەگەیـی و لە شـوێنێکی تـر بە بەرد و کێڵێکـی

بـــێ ناونیشـــان کە هـــیچ زانیـــارێکی بـــۆ ناســـاندنی ئەو ئینســـانە هەڵکەوتەیە نەدەدرکاند، ئەسپاردەی خاک کرا.